هاوڕێ باخەوان

# کوردستان

## نیشتمانی یەکەمینی سۆمەرییەکانە







Aras Press and Publishers
Kurdistan - Erbil
2003
www.araspublisher.com

# کوردستان

## نیشتمانی یەکەمینی سۆمەرییەکانە



دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی



زنجیرەی ڕۆشنبیری

*

**خاوەنی ئیمتیاز: شەوکەت شێخ یەزدین**

**سەرنووسەر: بەدران ئەحمەد حەبیب**

* * *

ناوونیشان: دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، گەڕەکی خانزاد، هەولێر

س. پ. ژمارە: ١

www.araspublisher.com

# کوردستان

## نیشتمانی یەکەمینی سۆمەرییەکانە

لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی بەراوردکارییە
کە لە دۆزی سۆمەرییەکان دەتۆژێتەوە و ڕەسەنیان
دەباتەوە سەر چیاکانی کوردستان

**هاوڕێ باخەوان**



**ئەم لێکۆڵینەوەیەم پێشکەشە:**
**بەدایکم و باوکم**

هاوڕێ باخەوان - ١٩٩٦

ناوی کتێب: کوردستان نیشتمانی یەکەمینی سۆمەرییەکانە
نووسینی: هاوڕێ باخەوان
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ١٩٣
دەرهێنانی هونەری: بەدران ئەحمەد حەبیب
بەرگ: ئاراس ئەکرەم
نووسینی سەر بەرگ: محەمەد زادە
پیت لێدان: نسار عەبدوڵڵا
هەڵەگری: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل
هەڵەگری سەر کۆمپیوتەر: عەزیز عەبدولخالق + دلاوەر صادق ئەمین
سەرپەرشتیی کاری چاپخانە: ئاوڕەحمان مەحموود
چاپی یەکەم - چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر- ٢٠٠٣
لە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕۆشنبیری و هونەر لە هەولێر ژمارە (٩١)ی ساڵی ٢٠٠٣ی دراوەتێ

# نێوەڕۆک

# پێشەکی

چەند ساڵێک لەمەوبەر، بەمەبەستی نووسینی لێکۆڵینەوەیەکی کۆمەڵایەتی و رامیاری لەسەر مێژووی کوردستان و کورد و هۆی دروست نەبوونی دەوڵەتێکی کوردی لە دوای رووخانی مادەکانەوە و هەروەها پەیوەندیی بیروباوەڕە ئایینییەکان لەسەر بیرکردنەوە و کەسایەتی و ژیرێتیی کورد و بۆ ئەوەی نووسینەکەم زێتر کالایەکی ئەکادیمییانە بەخۆوە بگرێت و هەموو کون و کەلەبەرێکی مێژووی ولاتی کوردەواری بگرێتەوە، ویستم لە بەرەبەیانی مێژووەوە دەستی پێ بکەم و ئەشکەوت و چەپەر و پەنا چیاکانی کوردستان بکەمە خاڵی سەرەتاییی ئەو نووسینە. هەر بۆ ئەم مەبەستە کەوتمە خوێندنەوەی دەیان و بگرە زێتری ئەو نووسراوانەی کە مێژووان و ئارکیۆلۆژییە جیهانییەکان لەسەر مێژووی کۆنی ناوچەی خۆرهەڵات و کوردستان نووسیویانە... لە ئەنجامی ئەو خوێندنەوانەمدا زۆر بەڕاشکاوییەوە بۆم دەرکەوت، کە مەزنترینی ئەو نەتەوانەی کە لە ناوچەی خۆرهەڵاتی نزیکدا، ژیابێتن و خاوەنی بەرزترین شارستانیی مێژووی مرۆڤایەتی بووبێتن، سۆمەرییەکان بوون و (نیشتمانی یەکەمینیشیان کوردستانەکەی ئێمەیە)، ئینجا لەبەرئەوەی کە تاوەکو ئێستا هیچ کەسێک بەلێکۆڵینەوەیەکی وا سەربەخۆ لە رەسەنی ئەم سۆمەرییانەی نەکۆڵیوەتەوە، من زۆر بەپێویستم زانی کە لێی بتۆژمەوە و بەچەندین بەڵگەی مادییەوە رەسەنیان بگەڕێنمەوە سەر ولاتی کۆنی کوردەواری.

بردنەوەی رەسەنی سۆمەرییەکان بۆ چیاکانی کوردستان بەشێوەیەکی زانستانە، بەرپەرچدانەوەیەکی هەموو ئەو زانا و مێژوونووسە ئارکیۆلۆژیستانەیە کە بەڕەسەنی ئەم سۆمەرییانەیان دەگوت: (کێشە و ئەندێشە و تەراویلکە)، ئەمە جگە لەوەی کە ئێمەی کورد هەروەکو چۆن شانازی بەوەوە دەکەین کە نیشتمانە دێرینەکەمان یەکەمین شوێنەوارە لە جیهاندا کە کشتوکاڵی تێدا کرابێت و یەکەمین گوندی نیشتەنیی تێدا هاتبێتە بوون... هەر بەو پێیە و بگرە زێتریش دەبێت شانازی بەوەوە





بکەین، کە چیاکانی کوردستان نیشتمانی یەکەمینی سۆمەرییەکانە...

هەر بۆیە ئەم لێکۆڵینەوەیەم بەپێویست زانی و پلانی نووسینەکەشم بەم شێوەیەیە کە کردوومە بەحەوت بەشەوە و بریتین لە:

**بەشی یەکەم:**

ئەم لێکۆڵینەوەیە بۆچی؟

لەم بەشەی باسەکەدا وەڵامی ئەو پرسیارەم داوەتەوە کە ئایا سۆمەرییەکان، کوردستانی بووبێتن یان نا؟!... ئێمەی کورد ئێستا چ سوودێکیان لێ وەردەگرین؟ و هەروەها لەو شاکارە مەزنانەش دواوم کە سۆمەرییەکان پێشکەشی مرۆڤایەتییان کردووە.

**بەشی دووەم:** لەژێر سەردێری (کوردستان، لانکەی مرۆڤ و شارستانییە) باسێکی مێژووی ناوچەی خۆرهەڵاتی نزیک و کوردستانم کردووە و تیایدا ئاماژەی ئەوەم کردووە کە کوردستان لە سەدان هەزار ساڵ لەمەوبەرەوە مرۆڤی کۆنی تێدا ژیاوە و خاوەنی شارستانییەکی زۆر سەرەتایی بوون و پاشان وردە وردە و بەپێی تێپەڕبوونی کات پەرەیان بەم شارستانییە داوە و نێوی هەندێک لەو شوێنەوارە گرنگانەم هێناوە لەگەڵ تەمەنی شارستانییەکەیاندا...

**بەشی سێیەم:** باسی گواستنەوەی شارستانیم لە کوردستان و باکووری میزۆپۆتامیاوە بۆ باشووری کردووە کە (دەشتی لیتەیی)یە و بەچەندین بەڵگەی مادی و ئارکیۆلۆژییەوە و پاشان لە رەسەنی (فوراتییە سەرەتاییەکان) دواوم و هەروەها رای هەندێک لە زانا بەنێوبانگە جیهانییەکانم لەسەر گواستنەوەی شارستانی لە کوردستانەوە بۆ دەشتی لیتەیی نووسیوە.

**بەشی چوارەم:** لە ناوچەکانی باشووری میزۆپۆتامیا دواوم، تاوەکو چاخە مێژووییەکان و تێیدا باسی کێشەی کەناری کەنداوی فارسیم کردووە کە بەزاراوەی جیۆلۆجی پێی گوتراوە دەریای (تیش- TETHYS) و بەراوردێکم کردووە لەنێوان هەردوو تیۆرەکەی زانایان

(دی مۆرگان) و (لیز و ڤالکۆن و رایت) کە پەیوەندییەکی زۆریان بەسەرەتای دروستبوونی شارستانی و نیشتەجێ بوونی مرۆڤ، لە دەشتی لیتەییدا هەیە.

**بەشی پێنجەم:** باسی کێشەی سۆمەرییەکانم کردووە و تیشکم خستۆتە سەر رای هەندێک لە زانا ئارکیۆلۆژییە بەنێوبانگەکان و لەو رایانەش دواوم کە سۆمەرییەکانیان بردۆتەوە سەر ئەو ناوچانەی کە کوردستان نین.

**بەشی شەشەم:** لەم بەشەدا باسی کورتەیەکی مێژوویی سۆمەرییەکانم کردووە و لە زۆربەی بنەماڵە فەرمانڕەوا و شارستانییان و بارە کۆمەڵایەتییەکانیان و ئایین و زانست و ئەدەب و هونەریان دواوم، ئەمە جگە لە داهێنانی نووسینی مێخی هەروەها باسی پەیوەندیی فوراتییە سەرەتاییەکان و سۆمەرییە هەرە کۆنەکانم کردووە...

**بەشی حەوتەم:** بریتییە لە گرنگترین بەشەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیە، باسی یەکەمین نیشتمانی سۆمەرییەکانم کردووە، کە ئەویش کوردستانە، هەروەها باسی ئەو بەڵگانەم کردووە کە گەواهی بۆ یەکەمین نیشتمانی سۆمەرییەکان دەدەن، کە بریتین لەم بەڵگانە:

**بەڵگەی یەکەم:** بەراوردێکە لە نێوان دراوسێکانی وڵاتی سۆمەرییەکاندا.

**بەڵگەی دووەم:** کەرەستە ئارکیۆلۆژییەکان، کە بریتییە لە بەراوردێک لە نێوان ئەو کەرەستە ئارکیۆلۆژییانەی کە لە کوردستان و وڵاتی سۆمەردا دۆزراونەتەوە.

**بەڵگەی سێیەم:** زمانی سۆمەرییەکان، کە ئەمیش هەر بەراوردێکە لە نێوان زمانی سۆمەرییەکان و زمانە کۆنەکانی کوردستان و زمانی کوردیی ئێستا و بەدەیان زاراوە، نزیکیی ئەو زمانانەم لە یەکترەوە روون کردووەتەوە.

**بەڵگەی چوارەم:** ئایینی سۆمەرییەکان، کە بەتەواوەتی بۆمان روون دەبێتەوە کە ئایینە کۆنەکانی کوردستان رەسەنی ئایینە





سۆمەرییەکانن و پەیوەندییەکی زۆر بەهێز لە نێوانیاندا هەیە.

**بەڵگەی پێنجەم:** کە باسی پەرستگاکانی زەکوورەم کردووە و خاڵی سەرەتای دروستبوونیانم بردۆتەوە سەر چیاکانی کوردستان.

**بەڵگەی شەشەم:** لە ئەفسانە سۆمەرییەکان دواوم، کە چۆن هەر سۆمەرییەکان خۆیان بەهۆی ئەم ئەفسانانەوە رەسەنی خۆیان دەبەنەوە سەر چیاکانی کوردستان و بەشوێنێکی زۆر پیرۆزی دەزانن.

**بەڵگەی حەوتەم:** باسی چیرۆکی لافاوە مەزنەکەم کردووە، وەک بەڵگەیەکی تری کوردستانی بوونی سۆمەرییەکان...

## کۆتایی و سەرەنجام

پاشان لەژێر سەردێڕی (کۆتایی و سەرئەنجام)دا باسی ئەنجامە بەدەست هێنراوەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیەشم کردووە. لێرەدا جێی خۆیەتی کە ئەوە بڵێم: لە ساڵی ١٩٨٩دا لە هێڵە گشتییەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیە بوومەوە و پاکنووسم کرد. بەڵام هەر بواری چاپکردنی بۆ نەڕەخسا و لەم دواییەدا کەمێک دەسکاری و بەچەند سەرچاوەیەکی نوێ فراوانترم کرد... بەو هیوایەی کە توانیبێتم بەم لێکۆڵینەوەیەم خزمەتێکی تری کورد و مێژووی نەتەوەکەمم کردبێت...

*هاوڕێ باخەوان*

*هۆڵندا - خرۆنینن* ١٩٩٥/١١/٣٠

# بەشی یەکەم

## ئەم لێکۆڵینەوەیە بۆچی؟

بۆچی رەسەنی سۆمەرییەکان بەرینەوە سەر چیاکانی کوردستان...؟ سۆمەرییەکان ئەگەر کوردستانی بووبێتن یان نا؟ ئێمە ئێستا چ سوودێکیان لێ وەردەگرین؟ لە کاتێکدا کە ئەوان نەک خۆیان بەڵکو زمانەکەشیان چۆتە گۆڕستانی مردووانەوە. سۆمەرییەکان، بەیەکێک لەو نەتەوانە دەژمێردرێت کە خاوەنی مەزنترین شارستانی و کلتوور بووبێتن، هەرچەندە کوردیش خاوەنی شارستانی و فەرهەنگی خۆیەتی بەڵام ئەگەر وڵاتەکەی ئێمە ببێتە رەسەن و نیشتمانی یەکەمینی ئەو سۆمەرییانە ئەوا بەو پێیە فەرهەنگ و کلتووریشمان زێتر و زێتر دەوڵەمەندتر دەبێت، چونکە ئەمڕۆ تاکە پێوانە بۆ شانازی و ژیاری هەر گەلێک فەرهەنگەکەیەتی. کەواتە ئێمە سەرباری هەموو ئەو پلە شارستانییەی کە لە مێژووی خۆماندا پێی گەیشتووین، بشبینە خاوەنی یاخود خاڵی سەرەتایی شارستانیی سۆمەرییەکان، فەرهەنگەکەشمان دەگاتە رادەیەکی وا کە وڵاتەکەمان ببێتە لانکە و جێ نزرگەی یەکەمین یاخود مەزنترین شارستانییەکانی سەر رووی زەمین...

ئەم شارستانییە و پێشکەوتن و تەکنۆلۆژیایەی کە ئێستا مرۆڤایەتی پێی گەیشتووە، پرۆسەیەکی کتوپڕ و لە ناکاو نییە، بەڵکو زادەی تەواوی ئەزموونەکانی خودی مرۆڤە بەدرێژایی مێژوو، لەبەرئەوە مرۆڤایەتیی ئێستێ گەلێک قەرزاری مرۆڤی کۆنە لە هەموو پلەکانی زانستدا، چونکە باوەڕناکەم کە هیچ کەرەستەیەکی شارستانیی ئەمڕۆ رەگوریشەکەی نەگەڕێتەوە بۆ هەزاران ساڵ لەمەوبەر و مرۆڤی کۆن بەردی بناغەکەی دانەڕێشتبێت. سۆمەرییەکان ئەو رەگەزە کوردستانییەن کە لە هەموو بوارەکانی زانست و هونەر و ئایین و ئەدەب و رامیاری و یاسادا بەپێی ئەو سەردەمەی خۆیان شارەزاییەکی زۆر باشیان هەبووە و بەیەکێک لە





ژیاریترین نەتەوە کۆنەکان دادەنرێت و ئەو نەتەوانەشی کە لە دوای ئەوانەوە بەردەوامی و گەشەیان بەشارستانی داوە، هەر هەمان ئەو کەرەستانەن کە لە لایەن سۆمەرییەکانەوە داهێنراون و ئەمانیش بەپێی تێپەڕبوونی کات پێشیان خستوون. نموونەی ئەو نەتەوانە بابل و ئەکەد و ئاشووری و فیرعەونەکان و هی ترن، کە جگە لە بەرەوپێشخستنی زانست و هونەر و ئەدەب و ئایینی سۆمەرییەکان زێتر نوێکارییەکی ئەوتۆیان وەک داهێنان پێشکەشی مرۆڤایەتی نەکردووە! بێجگە لەو هەرەمانەی کە فیرعەونەکان دروستیان کردووە کە ئەویش خاڵی بنەڕەتییان دەگەڕێتەوە بۆ زەکووڕەی سۆمەرییەکان...

ئاشکرایە کە داهێنانی نووسین بۆ یەکەم جار لە مێژوودا لەلایەن و لەسەر دەستی زانا سۆمەرییەکان بەدی هات و هەرچی ئەدەب و زانست و یاسا و تێکستی ئایینی و تەنانەت ژیانی کۆمەڵایەتیی خۆشیانیان بەهۆی ئەو داهێنانە مەزنەوە بۆ تۆمار کردووین... نووسین یەکێکە لەو بەرهەمە شارستانییانەی کە ئەگەر تاوەکو ئێستا نەهاتایەتە بوون! رەوڕەوەی مێژوو و شارستانی بەم شێوەیە نەدەبوو و مرۆڤایەتی بەهیچ شێوەیەک نەدەگەیشتە ئەم پلە پێشکەوتووەی کە ئێستا لەبەر چاوماندایە و هەستی پێ دەکەین، و تا ئێستاش ئێمە هەر لە چاخە پێش مێژووییەکاندا دەژیاین...!

ئەمە جگە لەو کارە هونەرییە سەرسوڕهێنەرانەی کە هونەرمەندە سۆمەرییەکان لە دروستکردنی هەزاران هەزار پەیکەر و دەیان زەکووڕە و کۆشکی پادشاییدا بەکاریان هێناوە کە بوونەتە خاڵی یەکەمینی هونەری پەیکەرتاشین و بیناسازی لە دوای خۆیانەوە و مرۆڤ بەهۆی ئەوانەوە گەیشتە رادەیەکی وا کە باخچە هەڵواسراوەکانی بابل و ئەهرامەکانی میسر و دەیان و سەدان پەرستگای نایابی وا دروست بکات کە تا ئێستاش جێگەی تێڕامان و سەرسوڕمانی ئەندازیارە بیناسازەکانی ئەمڕۆ بێت!. هەر پەیکەرەکانی وڵاتی سۆمەر بوو کە بووە سەرچاوە بۆ هونەرمەندە گریکەکان و پاشان تۆوی ئەو داهێنانە مەزنانەی لە مێشکی پەیکەرتاشی بەنێوبانگ

(مایکلٚ ئەنجیلۆ)دا دروست کرد و مرۆڤی گەیاندە ئەو رادەیەی کە کۆشکی لۆڤەری بەنێوبانگ دروست بکات، خۆ ئەگەر زێتر بێین بەرەو پێشەوە و سەیری هونەری پەیکەرتاشین و بیناسازیی ئێستای مرۆڤ بکەین هەر دەبێت رەسەنی ئەو پێشکەوتنە ببەینەوە سەر مرۆڤی کۆن و، بەتایبەتی سۆمەرییەکان.

لە بواری زانستیشدا، سۆمەرییەکان گەیشتبوونە پلەیەکی زۆر بەرز، بۆ نموونە لە ماتماتیکدا گەیشتوونەتە ئاستێکی وا کە بیردۆزی فیساگۆرس دابڕێژن، کە هەروەکو لەدواییدا باس دەکرێت گەڕاندنەوەی ئەم بیردۆزە و نێو بەسەر دابڕینی بەنێوی زانایەکی گریکییەوە هەڵەیەکی مێژوویی گەورەیە، چونکە هەمان بیردۆز لەسەر یەکێک لە تەختە گڵەکانی سۆمەرییەکاندا دەخوێنینەوە. هەروەها سۆمەرییەکان لەو سەردەمەدا زانستی سێگۆشەکانیشیان زانیوە و خاوەنی چەندین بیردۆز و داهێنانی سەیربوون لە ماتماتیکدا.

لە بواری کیمیاگەریشدا گەیشتوونەتە پلەیەکی بەرز و جۆرەها کانزا و ماددەی کیمیاوییان ناسیوە و بۆ کاروباری رۆژانەی خۆیان بەکاریان هێناوە و خاوەنی تاقیگەی تایبەتی بوون. هەروەها زانا سۆمەرییەکان، بەتایبەتی زێوانی پەرستگاکان دەستێکی باڵایان هەبووە لە ئەستێرەناسی و نێولێنانیان و دۆزینەوەی دوازدە بورگەکە و لە هەندێک تەختە گڵێشدا خۆرگیران و مانگ گیرانی ئەو سەردەمەی خۆیانیان بۆ تۆمار کردووین کە گەردووناسەکانی ئەمڕۆ ئەو خۆرگیران و مانگ گیرانانەی سەردەمی سۆمەرییەکانیان لە هەمان ئەو کاتەی کە تۆماریان کردووە، سەلماندوویانە و باوەڕیان پێ هێناوە!!.

پاشان هەندێک تەختە گڵ دۆزراونەتەوە کە باسی زۆر جۆری نەخۆشی و چارەسەرەکانیان دەکات و لە سەردەمی سۆمەرییەکاندا پزیشکی تایبەتی هەبووە کە چارەسەری خەڵکی نەخۆشی کردووە.

کۆمەڵگەی سۆمەری کۆمەڵگەیەکی رێکوپێک بوون و خاوەنی چەندین رێسا و یاسای تایبەتی بوون کە پادشاکان بەنێوی خوداوەندی مەزنەوە





دەریان کردووە، هەروەکو باوە و دەڵێن کە کۆنترین یاسا لەجیهاندا ئەو دووسەد و هەشتا و دوو ماددەیەیە کە حامورابیی پادشای بابلییەکان لەسەر میلە بەنێوبانگەکەی خۆی تۆماری کردووە کە ئێستا لە مۆزەخانەی لۆڤەر دایە. ئەمە رایەکی چەوتە و کۆنترین یاسا کە تائێستا دۆزرابێتەوە یاسای (ئۆرنەمو) کە پادشایەکی سۆمەری بووە و پاش ئەمیش یاساکانی (لبث ئەشتار) و (ئەشتۆنا) دێنە کایەوە کە ئەمانیش هەر سۆمەرین، ئەوەی شایانی باسە ئەو ماددانەی کە لە میلەکەی حامورابی دان هەر هەمان یاساکانی ئۆرنەمو و لبث ئەشتار و ئەشتۆنای سۆمەرییەکانە، بەڵام بەشێوەیەکی ستەمتر و شێوازی نووسینێکی تر، تەنانەت رێسای (چاو بەچاو و ددان بەددان – العین بالعین والسن بالسن) کە لە قورئاندا هەیە لە هەمان یاساکانی سۆمەرییەکاندا هەیە...؟!

کەواتە سۆمەرییەکان یەکەمین نەتەوەن کە خاوەنی کۆمەڵگەیەکی رێکوپێک بووبێتن و یاسایان داهێنابێت، کە هەر ئەو یاسایانەن بوونەتە خاڵی سەرەتای یاساکانی مانۆی هیندی و دراکۆن و سۆلۆنی گریکی و یاسای دوازدە بۆردەکە و کۆمەڵەی جۆستنیانی رۆمانی و شەریعەتی جووەکان و ئیسلام و پاشان یاساکانی ئێستای مرۆڤایەتی و ماددەکانی کۆمەڵەی گەلان و جاڕی جیهانیی مافی مرۆڤ و بڕوانامەی نەتەوە یەکگرتووەکان... لە بواری فێرکردنیشدا هەر بەهەڵە دەگوترێت کە لە سەردەمی حامورابیدا، بۆ یەکەمین جار لە مێژوودا قوتابخانە هاتۆتە کایەوە!... نەخێر هەر سۆمەرییەکان بوون کە یەکەمین فێرگەیان لە مێژوودا کردەوە، کە لە نێو پەرستگاکاندا بوون و قوتابییە سۆمەرییەکان لەسەر تەختە گڵەکان فێری زانست و ئەدەب و وانە ئایینییەکان دەبوون...

ئەدەب لە ژیانی سۆمەرییەکاندا رۆڵێکی باڵای بینیوە و هەزاران تەختە گڵیان لەو بارەیەوە بۆ بەجێ هێشتووین، کە باسی تێکستەکانی چیرۆکی ئافراندنی گەردوون و چیرۆکی گڵگامش و ئادابا و دابەزینی خوداوەند ئەشتار بۆ جیهانی خواروو و هتد دەکەن. ئەم چیرۆکانە هەتاوەکو ئێستاش لەپاش دۆزینەوەیان وەک ماددەیەکی ئەدەبیی زۆر بەنرخ لە زانکۆکانی

جیهاندا دەخوێندرێن، چونکە یەکەمین سەرەتایە بۆ دروستبوون و گەشەسەندنی ئەدەب لە مێژوودا. ئەو تێکستە ئەدەبییە سۆمەرییانە پەیوەندییەکی راستەوانەیان هەیە لەگەڵ ئەدەبی دوای سۆمەرییەکان خۆیان و ئەدەبی سەدەکانی ناوەڕاست و ئێستادا، بۆ نموونە چیرۆکە بەنێوبانگەکەی (دابەزینی خوداوەند ئەشتار بۆ جیهانی خواروو) بووەتە خاڵی سەرەتا و بناغەی زانست و ئەدەبی بێ باوەڕی (ئاتەییزم: الالحاد)، چونکە ئەم چیرۆکە گاڵتەجارییەکی تەواوی تێدایە بەڕۆژی دوایی و بەهەشت و دۆزەخ، بەبۆچوونی من هۆزانەوان و فەیلەسووفی عارەب (ئەبو عەلای معەڕی) سروشی چیرۆکە بەنێوبانگەکەی خۆیی هەر لەم چیرۆکەی سۆمەرییەکانەوە وەرگرتووە کە نێوی ناوە (رسالة الغفران: نامەی لێبووردن) کە تێیدا زۆر بەڕاشکاوی گاڵتە بەئایینەکان و ڕۆژی دوایی دەکات.

هەروەکو بەردەوامییەکی ئەم جۆرە ئەدەبە، نووسەری ئیتاڵی (دانتی)، (کۆمیدیا خوداییەکە)ی نووسی و ئەویش (رسالة الغفران)ی وەک سەرچاوەیەک بەکارهێناوە. لە نووسینی ئەم جۆرە ئەدەبەدا نابێت شەهید (ئەمین)ی خۆشمان لەیاد بکەین، کە لە ئۆردوگای (جەهروم)ی ئێراندا ساڵی ١٩٦٤ هەڵبەستێکی دوور و درێژی لەم بابەتە نووسیوە کە تێیدا گاڵتەجارییەکە بۆ رۆژی دوایی و هەموو نەتەوەکان بەپێغەمبەرەکانیانەوە دەچنە بەهەشتەوە، تەنها نەتەوەی کورد و زەردەشت پێغەمبەر نەبێت دەچنە دۆزەخەوە! ئەوی راستی بێت ئەم هەڵبەستە نایابە بەداخەوە تاوەکو ئێستا چاپ نەکراوە و تەنها لەسەر کاسێتێک تۆمارکراوە. لە بەراوردکردنی ئەو تێکستانەی سەرەوەدا بۆمان دەردەکەوێت کە چۆن ئەدەبی سۆمەری بووەتە سەرچاوە و سروش بۆ ئەدەبی پاش خۆیان و تا چ رادەیەک کاریان کردۆتە سەری.

رامیاریش وەک زانست لە وڵاتی سۆمەرییەکاندا زۆر پێشکەوتوو بووە. هەر پادشایەکی سۆمەری چەند راوێژکارێکی خۆیی هەبووە. تەختە گڵەکانی داستانی گلگامیشی بەنێوبانگ ئەوەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە لە





وڵاتی سۆمەردا، دوو ئەنجوومەن هەبوون، یەکەمیان (ئەنجوومەنی پیران) و ئەوی تریشیان (ئەنجوومەنی جەنگاوەران) بوون، کە ئەمانە لەنێو چینە سەربەستەکاندا هەڵبژێردراون. ئەم دوو ئەنجوومەنە شان بەشانی پادشا و راوێژکارانی بەشداریی رامیاریی سۆمەرییەکانیان کردووە و فەرمانی دەست پێکردنی جەنگ ئەوان داویانە، کە ئەوە دەگەیەنێت سەرەتاکانی دیموکراسی لە سەردەمی سۆمەرییەکانەوە سەری هەڵدابێت نەک گریکەکان، پاشان ئەو دوو ئەنجوومەنە شێوەی پەرلەمانێکی سەرەتایی ئەو سەردەمە بوون بەپێی زانستی رامیاریی ئێستێ، کەواتە سەرەتاکانی پەرلەمان و بەپراکتیک کردنیشی هەر دەگەڕێتەوە سەردەمی سۆمەرییەکان نەک بۆ (پەیمانی مەزن – CARTA - MAGNA)ی ئینگلستان لە ساڵی 1215 ز دا و پاشان گۆڕینی نێوەکەی بۆ پەرلەمان...! لەبەرئەوە دەتوانین بڵێین کە سۆمەرییەکان خاوەنی سەرەتاکانی زانستی رامیاری بوون.

هەروەکو لە بەشەکانی پێشوودا باس کرا، ئایین رۆڵێکی کاریگەر و ترسناکی لە ژیانی مرۆڤی کۆندا هەبووە، بەتایبەتی لە سەردەمی سۆمەرییەکاندا. ئەو تەختە گڵینانەی کە سۆمەرییەکان دەربارەی بیروڕا ئایینییەکانی خۆیان بۆ ئێمەیان بەجێ هێشتووە، رۆشنایی دەخەنە سەر زۆر گرێ کوێرە کە پەیوەندییان بەمێژووی دروستبوونی بیروڕا و نووسراوە ئایینییەکانی پاش خۆیانەوە هەیە. ئەگەر بێت و سەرنجی ئەو تەختە گڵینانە بدەین، دەبینین هەمان ئەو چیرۆکە ئایینییانەی کە لە کتێبەکانی تەورات و قورئان و ئەوانی تردا هەیە، لە تەختە گڵە سۆمەرییەکانیشدا تۆمارکراون، کە ئەوەمان بۆ دەسەلمێنێت ئەو چیرۆکە ئایینییانە زۆر کۆن بن، تاکە جیاوازییەک لەنێوان ئەو چیرۆکانەدا کە هەبێت گۆڕینی نێوی پاڵەوانانی ئەو چیرۆکانەیە! بۆ نموونە چیرۆکی لافاوەکە کە لە تەختە گڵینەکانی سۆمەردا هەیە و نێوی پاڵەوانە رزگارکەرەکەی مرۆڤایەتی (زیوسەدرا)یە و (نوح) نییە کە وەکو لە تەورات و قورئاندا هاتووە، دیارە نێوی زیوسەدرا راستترە چونکە، ئەو تێکستە سۆمەرییانە هەزاران ساڵ لە تەورات و قورئان کۆنترن، چیرۆکەکانی ئادەم و حەوا و قابیل و هابیل و شێوەی لەدایکبوونی موسا پێغەمبەر و رۆژی دوایی و بەهەشت و دۆزەخ

و... زۆربەی ئەو چیرۆکانەی تر کە لە کتێبە ئایینییەکاندا، هەن. پێش ماوەیەکی زۆر سۆمەرییەکان لەسەر تەختە گڵەکانی خۆیان تۆماریان کردووە، بەڵام نێوی پاڵەوانی ئەو چیرۆکانە سۆمەری بوون ئەگینا هەمان مەبەست و واتایان هەیە...؟!

لەمەوە دەتوانین سەرنجی ئەو وتە مێژووییە بدەین کە لە کاتێکدا محەمەدی عارەب قورئانی بۆ (ئەبو جەهل)ی مامی خوێندووەتەوە تاوەکو خۆی بەدەستەوە بدات، بەڵام ئەو باوەڕی پێ نەکردووە و پێی گوتووە ئەم شتانەی تۆ باسی دەکەیت هەموو (أساطير الأولين)ە، واتە ئەفسانەی پێشینە!.

ئایینی سۆمەرییەکان بەردی بناغەی ئایینی سامییەکان و فیرعەونەکان و جوو و فەلە و ئەوانی ترن، کە ئەوەندەی تر ئایین و شارستانیی سۆمەرییەکانمان لە لا دەکاتە خاڵی سەرەتای هەموو ئایینەکانی دی...

هەر ئەم سۆمەرییانە لە بواری کشتوکاڵی و ئاودێری و رستن و چنین و پیشە دەستییەکان و ئەو کەرەستە شارستانییانەی کە پەیوەندییان بەژیانی رۆژانەیانەوە هەبووە، زۆر تێیدا پێشکەوتوو بوون، ئەمە جگە لە زانستە سەربازییەکان و دروستکردنی جۆرەها چەکی ئەو سەردەمە، کە بێگومان ئەوانیش بوونەتە خاڵی سەرەتا بۆ هەموو ئەو کەرەستانەی کە ئەمڕۆ دەیانبینین.

ئەوانەی کە باس کران شاکارەکانی سۆمەر بوون و ناکرێت دەربارەی هەموو ئەو شتانە بدوێم کە سۆمەرییەکان بۆ ئاسانکردنی ژیانی خۆیان پێشکەشی مرۆڤایەتییان کردووە، چونکە ئەوە زۆری پێ دەوێت و ئەوانەی کە باسیش کرا مشتێک بوون لە نموونەی خەرواری زانست و شارستانیی سۆمەرییەکان.

هەر چۆنێک بێت ئێمەی کورد دەبێت شانازی بەوەوە بکەین کە کوردستانەکەمان یەکەمین نیشتمانی ئەو رەگەزە مەزنەی مێژووی مرۆڤایەتییە، کە بووەتە یەکەمین تیشکی شارستانی و یەکەمین خولی بەتینی بەرەوڕەوەی شارستانی داوە و بووەتە هۆی ئەو پێشکەوتنەی کە





مرۆڤ ئێستا پێی گەیشتووە. ئەگەر سۆمەرییەکان لە مێژوودا نەبووبن، یاخود لە مێژووی مرۆڤایەتییان دەربهێنین، زۆر ستەم دەبوو کە جیهان و مرۆڤمان بەم شێوەیەی ئێستا بدیایە و ئەمە وەک ئەوە وایە کە بناغەی باڵەخانەیەکی چەند نهۆمی دەربهێنین و دیارە ئەنجامی ئەو باڵەخانەیە هەر رووخان و نەمانە... کەواتە کوردستانی کۆن بەبێ گفتوگۆ و ململانێ خاوەنی بەرزترین و مەزنترین شارستانی بووە لە جیهاندا و بەو پێیە فەرهەنگ و کلتووری ئەو کاتەی کوردستانیش دەوڵەمەندترین فەرهەنگ بووە...

# بەشی دووەم

## کوردستان لانکەی مرۆڤ و شارستانییە

خۆرهەلاتی نزیک، یەکێکە لە هەرە گرنگترین ناوچەکانی سەر زەمین کە خاوەنی مێژوویەکی چڕوپڕ و تاڕادەیەک بەردەوام بوویێت، ئەم ناوچەیە هەر لە بەرەبەیانی مێژووەوە هەتاوەکو ئێستا رەوڕەوەی شارستانی تێیدا بێ وەستان و نەپساوە بووە[1]، دیارە ناوچەیەکی وا کە خاوەنی زنجیرەی چیای وەک زاگرۆس و تۆرۆس بێت، شارستانییەکەشی دەبێت هەروەکو لووتکەی ئەو چیا سەرکەشانە بەرز و بڵند بێت.

خۆرهەلاتی نزیک بەحوکمی ئەوەی کە ناوچەیەکی چیایی و جەنگەڵستان و هەوراز و نشێو و فرە ئەشکەوتە هەر لە کۆنی کۆنەوە جێ نزرگەی مرۆڤ بووە، کە لە چاخی بلایستۆسینەوە ئەشکەوت و دۆڵەکانی ئەم ناوچەیە مرۆڤی وەخۆی گرتووە و لە مەترسیی لافاو و بەفر و بەستەڵەک و جرۆجانەوەری ناوچەکە پاراستوونی.

باوەڕ ناکەم تەنها یەکێک لە ئەشکەوتەکانی ئەم ناوچەیە لەپاش پشکنین و هەڵکۆڵینی ئارکیۆلۆژی، جێ پێی مرۆڤی چاخە کۆنەکانی پێوە دیار نەبێت، تەنانەت هەندێک ناوچە هەیە چەندین ماددەی ئارکیۆلۆژی بەشێوەیەکی دیار لەسەر رووی زەوییەکەی بەرچاو دەکەوێت!. وەکو گۆزە و دیزە و ئامرازی بەردین و پارچە فەخفوری و چەندین شتی تر، ئەمەش بەئاشکرا لە ناوچەکانی دەشتی هەولێر و گردە دەستکردەکانی شارەزووردا یاخود (قەلایچەکاندا) بەدەردەکەوێت.

هەر لەبەر گرنگیی ئەم ناوچەیەشە کە زانایانی ئارکیۆلۆژی و مێژوونووسان کە دێنە سەر باسی مێژووی میزۆپۆتامیا و باشووری عێراقی کۆن لە ئەشکەوت و دۆڵەکانی (کوردستان)ەوە دەست پێ دەکەن، وەک خاڵێکی سەرەتا بۆ مێژووی خۆرهەلاتی ناوەڕاست بەگشتی و ناوچەی میزۆپۆتامیا و باشووری بەتایبەتی.







1 نەخشەی کودستان و میزوپۆتامیا

خۆرهەلاتی نزیک لە سەدەی بلایستۆسیندا کە لە (٦٠٠,٠٠٠) ساڵ لەمەوبەرەوە دەست پێ دەکات. یەک پارچە بەفر و بەستەڵەک بووە[2]، واتە جێگای ژیانی زیندەوەری تێدا ئەستەم بووە. بەڵام بەرەبەرە و پاش سەدان هەزار ساڵ ئاووهەوای ناوچەکە گۆڕاوە و فێنک بووە چاخی بلایستۆسین تاوەکو (٢٠٠,٠٠٠) ساڵ لەمەوبەر بەردەوام بووە، لە ماوەی ئەم چەرخەدا و لە بەستەڵەکستانی بلایستۆسیندا، هەندێک ناوچەی خۆرهەلاتی نزیک بەتایبەتی باشووری کوردستان ئەشکەوت و چەپەری چیاکانی داڵدەی مرۆڤی کۆن بوون، هەر لە چاخی بەردینی کۆنەوە واتە پێش (١٢٠,٠٠٠) ساڵ پێش ئێستێ تاوەکو کۆتایی چاخی بلایستۆسین

یاخود تا جێگیربوونی مرۆڤ لە گوندە بەراییەکاندا لەبەرئەوە مێژووی خۆرهەڵاتی نزیک وەکو زۆربەی ناوچەکانی تر لە ئەشکەوت و کونە شاخەکانەوە دەست پێ دەکات.

لە هەندێک لە ئەشکەوتەکانی ئەم ناوچەیەدا پاشماوە و جێ پێی مرۆڤی چاخی بەردینی کۆنی تێدا دۆزراوەتەوە، کە تەمەنی هەندێکیان دەگەڕێتەوە بۆ زیاتر لە (١٢٠,٠٠٠) ساڵ پێش ئێستێ بۆ نموونە ناوچەی (بەردە بەڵەک)، کە دەکەوێتە باکووری خۆرهەڵاتی چەمچەماڵ بەدووریی دوو کیلۆمەتر، چەندین ئامرازی ئارکیۆلۆژیی لەلایەن نێرژەیەکی ئامریکایی زانکۆی شیکاگۆوە تێدا دۆزراوەتەوە کە بریتین لە پارچە بەردی راو و هەروەها چەندین ئێسکی بەبەردبووی ئاژەڵی ئەو سەردەمەی وەک فیل و گا و مەڕ و بزن و چەندانی تر، مێژووی ئەم ئامرازانە دەگەڕێتەوە بۆ (١٠٠,٠٠٠) تا ٦٠,٠٠٠ ساڵ پێش ئێستێ[٣].

هەروەها شوێنەواری مرۆڤی چاخی بەردینی کۆن لە هەردوو ئەشکەوتی (زەرزی و هەزار مێرد)ی نزیک ناوچەی سلێمانی دۆزراوەتەوە کە تەمەنیان دەگەڕێتەوە بۆ (٦٠,٠٠٠) ساڵ لەمەوبەر[٤]. دیسان ئەشکەوتی (تەنگی پاپدا) لە ناوچەی بەختیاری و ئەشکەوتی (گڵی سوور) لە چیاکانی بێستوندا بۆ هەمان مێژوو دەگەڕێنەوە[٥].

پاشان لە ئەشکەوتی بەنێوبانگی شانەدەردا چەندین ئێسکی مرۆڤی ئەم چەرخە دۆزراوەتەوە کە ئەمیش هاوکاتە لەگەڵ ئەشکەوتی زەرزی و هەزارمێرد و بێستونی نزیک کرماشان و گۆڕاینی باکووری کوردستان[٦] و ئەشکەوتەکانی دیان و کۆتیک و هاودیان و کەیوانیان و ئەشکەوتی تامتامای نزیک دەریاچەی ورمێ[٧]. ئەشکەوتەکانی بێخاڵ و سەراندووری نێوان هەولێر و شەقڵاوەش. هەمان شوێنەواری مرۆڤی کۆنی تێدا دۆزراوەتەوە.

لە چاخی بەردینی ناوەڕاست و نوێشدا، هەمان ئەو ناوچە نێوبراوانە مرۆڤی کۆنی تێدا نیشتەجێ بووە، بۆ نموونە چینی (B)ی ئەشکەوتی شانەدەر کە بەهۆی (تاقیکردنەوەکانی کاربۆنی تیشکدەر)ەوە تەمەنی







2

ئەشکەوتی شانەدەر



3

هێڵکاریی تەختی زەویی ئەشکەوتی شانەدەر

بە( ١٠,٠٠٠ ) ساڵی پێش زایین دانراوە[٨] کۆنترین مرۆڤی شانەدەر کە لە خوارووترینی چینەکانی ئەم ئەشکەوتەدا دۆزراوەتەوە تەمەنی دەگەڕێتەوە بۆ زێتر لە ( ٦٠٠,٠٠٠ ) ساڵ پێش ئێستێ.

ئەشکەوتی شانەدەر تاکە ئەشکەوتە لە خۆرهەڵاتی نزیکدا کە کۆنترین مرۆڤی نێندەرتاڵی تێدا دۆزرابێتەوە[٩]. هەرچەندە لە یەکێک لە ئەشکەوتەکانی چیای (کەرمل)ی فەلەستین. ئێسکی ئەم مرۆڤی نیاندەرتاڵە دۆزراوەتەوە، بەڵام ئێسکی ئەم مرۆڤە لە هی شانەدەر پێشکەوتووترە و ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە مرۆڤی شانەدەر سەرچاوە و باوکی مرۆڤی کەرمڵ بوویێت و لە چیاکانی زاگرۆسی کوردستانەوە کۆچیان بۆ فەلەستین کردبێت.

پاش ژیانی ئەشکەوت و پەناکێوەکان، مرۆڤی کۆن بەرەبەرە و بەکۆمەڵ لە پێدەشتی ئەشکەوتەکاندا نیشتەجێ بوون و لە نزیک رووبارەکانەوە فێری راوەماسی بوون و هەروەها بەرەبەرە ئاژەڵیان ماڵی کردووە، یەکەم ئاژەڵ کە مرۆڤ ماڵیی کردبێت سەگ بووە، هەربۆیە کە ئێسکی سەگ بەزۆری لە شوێنەوارەکاندا دەدۆزرێتەوە.



4 درێژەبڕگەی چینەکانی ئەشکەوتی شانەدەر







5 چەند ئامێرێکی بەردینی مرۆڤی شانەدەر



6 ئێسکی مرۆڤی شانەدەر

مرۆڤی کۆن لە چاخی بەردینی نوێدا هەوڵی نیشتەجێ بوونی داوە. بۆ نموونە لە ناوچەکانی (کەریم شار و زاوی چەمی)دا[١٠] لە پێش (10,000) ساڵ لەمەوبەرەوە بەیەکەمین قۆناغی نیشتەجێ بوونی کاتی دادەنرێن، کە لە هاویندا تێیدا ژیاون و لە زستاندا لەبەر بەفر و باران و سەرما بەرەو ئەشکەوتەکان گەڕاونەتەوە[١١]. بەڵام گوندی (چەرموو) کە مێژووی دەگەڕێتەوە بۆ زێتر لە ( ٦,٧٠٠ ) ساڵ پ.ز دەتوانین بەگوندێکی




7 هەندێک کەرەستەی کۆنی ئەشکەوتی شانەدەر و بەردە بەڵەک

هەمیشەیی دابنێین کە لە بیست و پێنج خانوو پێک هاتووە و هەر خانوویەکیان لە چەند ژوورێکی بچووک دروست کراون، هەروەها لەم گوندەدا بزن و سەگ ماڵی کراون و خەڵکی ئەم گوندە بێجگە لە پەروەردەکردنی ئاژەڵ و راوکردن، کشتوکاڵیشیان زانیوە و دانەوێڵەی وەک گەنم و جۆ و هەروەها پاقلەی بەخەڵووزبووی تێدا دۆزراوەتەوە، جگە لە دۆزینەوەی دەسکەوان بۆ کوتانی دانەوێڵە و بەئاردکردنی، تاوەکو بکرێت بەنان(١٢). گوندی چەرموو بەکۆنترین گوند دادەنرێت کە مرۆڤی کۆنی تێدا







8 هەندێک کەرەستەی کۆنی گوندی چەرمو

نیشتەجێ بووبێت و کشتوکاڵی تێدا کرابێت، لە گوندی چەرموودا پیشەسازیی دەفر و ئامانی گڵێن زێتر پێشکەوتووە، کەلوپەلی کشتوکاڵ و راوکردنیشیان پەرەپێداوە. جگە لە دروستکردنی خوداوەندی دایک کە بریتین لە چەند پەیکەرێکی بچووکی ئافرەت کە بۆ مەبەستی ئایینی بەکارهێنراون.

ئەو گاسنانەی کە تا ئەم دواییانەش جووتیارانی کورد زەویی پەنا چیاکانی پێ دەکێڵن، سەرەتای دروستبوونی دەگەڕێتەوە بۆ گوندی



9 هەندێک کەرەستەی کۆنی گوندی زاوی چەمی

چەرموو، ئەوەی شایانی باس بێت هەمان جۆری ئەو گاسنانە لەسەر مۆرە لوولەییـیەکانی سۆمەردا بەرچاومان دەکەوێت کە پەیوەندیی رەسەنایەتی و کشتوکاڵیی سۆمەرییەکان دەردەخات بەکوردستانی کۆن و ئێستاوە.

پاشان ژمارەی گوندەکان بەرەو زۆربوون چوون، تا وای لێ هات زێتر بەرەو دەشتەکان هاتنە خوارەوە و بوونە هۆی دروستبوونی شاری گەورە کە لە دواییدا لێیان دەدوێم، وەکو گوندەکانی تەپەگۆران و تەپی ئاسیاب و کانی دەرەتەپەی خۆرهەڵاتی کوردستان و گوندی گۆیونۆی نزیک دیاربەکری باکووری وڵات(١٣).





کوردستان لەبەرئەوەی بەدرێژایی مێژوو و بگرە تاوەکو ئێستاش زستانی تەڕوتووش و بەفر و باراناوییە، هەر لە کۆنەوە مرۆڤی ئەم وڵاتە هەستێکی تایبەتیی بەرامبەر بەخۆر هەبووە، خۆشی ویستووە و پەرستوویەتی و قوربانیی بۆ داوە. چونکە لە زستانی سارددا گەرمی کردۆتەوە و لە ڕۆژیشدا رووناکیی پێ بەخشیوە، هەر بۆیە کە نوێژ و کڕنووشی بەیانیان و ئێواران لە کاتی هەڵهاتن و ئاوابوونی خۆردا بەکۆنترین نوێژ و نزا دادەنرێت.

پەرستنی خۆر بەرەبەرە لە کوردستاندا پەرەی سەندووە تا بەتەواوی لە ناوچەکانی تردا بڵاوبووەتەوە و لە زۆربەی شارەکانی باشووری میزۆپۆتامیادا پەیکەر و پەرستگای تایبەتی بۆ کراوە. هەروەها مرۆڤی کۆنی کوردستان ڕێزی مردووی زۆر گرتووە و ناشتوویەتی، کە ئەمەش لە گوندی چەرمووەدا هەستی پێ دەکەین و مردووەکانیان لەژێر تەختی ژوورە بازنەییـیەکانیاندا شاردۆتەوە. ئەمەش بەردەوامی دابونەریتی شانەدەرییەکانە کە مردووەکانی خۆیانیان بەگوڵەوە لە تەختی ئەشکەوتەکاندا ناشتووە؟!(١٤).

کوردستان لەچاو هەموو ناوچەکانی تر تاکە ناوچەیە کە خاوەنی ئەم هەموو کەلوپەلە شارستانییە بێت و پاشان لەلایەن ناوچەکانی تری دراوسێیەوە پێش خراوە و سوودیان لەو کەرەستە سەرەتاییانە وەرگرتووە.

ژیان لە ئەشکەوتەکاندا و ڕاوکردن و نیشتەجێ بوون لە گوندەکاندا و ماڵی کردنی ئاژەڵ و فێربوونی کشتوکاڵ و دروستکردنی ئامێری ڕاو و دەفر و ئامانی گڵێن و ئامێرەکانی کشتوکاڵ و هەستی ئایینی و چەندان شتی تر، لە پێش (٨,٠٠٠) ساڵ لەمەوبەرەوە هەر لە دروستبوونی مرۆڤی شانەدەرەوە لە کوردستاندا هەبوون، و نەبوونی ئەم کەرەستە شارستانییانە لە ناوچەکانی تردا لەو مێژووە ناوبراوانەدا ئەوە دەگەیەنێت کە چۆن دڵ خوێن بەسەر هەموو ئەندامانی لەشدا دابەش دەکات، کوردستانیش بەو شێوەیە مرۆڤ و شارستانیی بەسەر ناوچەکانی تردا دابەش کردووە. بۆیە دەتوانین بەبێ دوودڵی بڵێین (خۆرهەڵاتی نزیک و بەتایبەتی کوردستان

دڵی خۆرهەڵاتی نێوەڕاستە لە شارستانێتیدا و لانکەی مرۆڤایەتی و شارستانییە).

کوردستان لەبەرئەوەی ناوچەیەکی چیاییە و چیاکانیشی هەزاران ئەشکەوت و کون و کەلەبەری گرتۆتە خۆی کە لە دەیان هەزاران ساڵ لەمەوبەرەوە داڵدەی شانەدەرییەکانیان داوە، باشترین و گونجاوترین شوێنەوارستانە لە جیهاندا.

تەنها لە هەرێمی باشووری کوردستاندا بەڕەسمی نزیکەی (٣٣٦٤)



10 هەندێک کەرەستەی کۆنی گوندی کەریم شار





شوێنەواری کۆنی تێدایە[١٥]، کە بێگومان سێ هێندە و چوار هێندە و بگرە زێتری ئەم ژمارەیەش شوێنەواری تری تێدایە کە هێشتا دەستنیشان نەکراوە؟!... ئەوەی شایانی باس بێت کە لەو (٣٣٦٤) شوێنەوارە باوەڕناکەم تەنها (٦٤) جێگەی پشکنین و هەڵکۆڵینی ئارکیۆلۆژیی تێدا کرابێت، چ جای تەواوی هەموو ئەو ناوچانە بەشێوەیەکی ئەکادیمییانە بپشکنرێن، دەبێت چ هەرایەکی مێژوویی دروست ببێت و ئاخۆ دەبێت ئێمە خاوەنی چیی تر بین؟! هێشتا پێمان نەزانیوە. مامۆستا (تەها باقر) هەر لە خۆیەوە نەیگوتووە کە ئەگەر بێت و پشکنین و هەڵکۆڵینی تەواو لە چیا و ئەشکەوتەکانی کوردستاندا بکرێت هیچ دوور نییە مرۆڤی تری لە چەشنی جاوە و پەکینی تێدا بدۆزرێتەوە.

کەواتە دەستەواژەی «لانکەی مرۆڤایەتی و شارستانی» پڕ بەپێستی کوردستان و ناوچەی خۆرهەڵاتی نزیکە.

بۆ زێتر تێگەیشتنی ئەو بەروار و شوێنەوارانەی کوردستان، بڕوانە ئەم لیستەیە[١٦]:

## لیستەی بەروار و شوێنە کۆنەکانی کوردستان

| پێش زایین | نێوی چەرخ | شوێنەوار |
|---|---|---|
| 600,000 | چاخی بەردینی هەرەکۆن | بەردە بەڵەک |
| 120,000تا 600,000 | چاخی بەردینی کۆنی نێوەڕاست | هەزار مێرد شانەدەر (چینیD) |
| 35,000 | چاخی بەردینی کۆن | شانەدەر (C)، زەرزی پاڵی گەورە |
| 10,000 | چاخی بەردینی نێوەڕاست | شانەدەر (B)، کەریم شار مەلفەعات |
| 7,000 | چاخی بەردینی نوێ | چەرموو، حەسسونە |

## پەراوێزەكانى بەشى دووەم

(١) چەند جارێكى كەم شارستانى لەم ناوچەيەدا پساوە، ئەويش پاش كۆچكردنى هەر رەگەزێكى كۆچەر بۆ ئەم ناوچەيە، بۆ نموونە هاتنى عارەبە موسڵمانەكان و پاش ئەوانيش مەگۆلييەكان رەورەوەى شارستانيى لەم ناوچەيەدا بۆ ماوەيەك وەستاند.

(٢) بڕوانە لاپەڕە ٩، فوئاد حەمە خورشيد، العصر الجليدى البلايستوسينى في كردستان، بغداد، ١٩٨٦.

(٣) ب. لا. ٤٩-٥٠، العراق في التاريخ، أعداد نخبة من أساتذة التاريخ، بغداد، ١٩٨٣.

(٤) ب. لا. ٢٦، د. هاري ساكز، عظمة بابل، موصل، ١٩٧٩.

(٥) ب. لا. ٥٤، د. جەمال رەشيد ئەحمەد، گۆڤارى رۆشنبيرى نوێ، ژمارە، ١١١ .

(٦) ب. لا. ٧٤، جۆرج رۆ، العراق القديم، بغداد، ١٩٨٤ .

(٧) ب. لا. ٣٩، د. سامي سعيد احمد، رضا جواد الهاشمي- تاريخ الشرق الأدنى القديم، بلا تاريخ.

(٨) ب. لا. ٧٥ جۆرج رۆ، سەرچاوەى پێشوو.

(9) P. 73 - Prof. Dr. Göran Burenhult - De ecrste mensen - Hoogleraar Archeologie - Universiteit van Stokholm, Sweden-
Printed in Hong Kong - 1994.

(10) P. 14 - Samuel Noah Kramer -
De bakermat der beschving - N. V.
Het Parool - Amsterdam - 1968.

(١١) ب. لا. ١٨٨، د. طه باقر، مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة، الجزء الأول، الطبعة الثانية، بغداد، 1986.

(12) P. 10 - Dr. M. V. Seton - Willams - BABYLON.
Kunstschattten uit Mesopotamië - Vertaling:
Stichting Tekstverzorging, Amsterdam - Printed in Japan - 1981.

هەروەها بڕوانە لا. 14، س. پ، KRAMER.

(13)P. 10 - Dr. M. V. Seton - Williams.

(14) P. 73 - Prof. Dr. Göran Burenhult.

(١٥) ئەم سەرژمێرييە خۆم لە كتێبى (المواقع الأثرية في العراق)دا، مديرية الآثار العامة، بغداد، ١٩٧٠، كردوومە.

(١٦) ب. س. پ. لا، ٦٦٤، جۆرج رۆ.



# بەشى سێيەم

## گواستنەوەى شارستانى

## لە كوردستانەوە بۆ باشوورى ميزۆپۆتاميا

هەروەك لە پێشەوە باس كرا، كە چياكانى زاگرۆس هەر لە كۆنەوە شانەدەرييەكانى تێدا ژياوە و ئەمانيش بەپێى هۆش و توانا و بارودۆخى ئەو سەردەمەى خۆيان هەوڵى دروستكردنى شارستانێتييان داوە. ئەمەش بەهۆى ئەو بەڵگە ماديية ئاركيۆلۆژييانەوە بۆمان دەردەكەوێت كە لە ئەشكەوت و ناوچەكانى وەك بەردەبەڵەك و هەزارمێرد و بێستون و شانەدەر و گۆڕاييينەوە بەدەستمان گەيشتووە.

شانەدەرييەكان بەگوندەكانى زاوى چەمى و چەرمووەوە نەوەستان، هەروەكو چۆن لە ئەشكەوتەكانى شانەدەر و زەرزى و هەزارمێرد و سەدانى تريشدا هاتنە دەرەوە.

لەپاش تەكنيك كردنى كشتوكاڵ بەشێوەيەكى لەوسا پێشكەوتووتر و پێشكەوتنيان لە شێوازى ژيان و كاروبارى رۆژانەياندا، ئەمجارە هەندێكيان بەيەكجارى چياكانيان بەجێ هێشت و بەرەو دەشتەكانى هەولێر و موسڵ و رووبارى سيروان خشان.

لە پێش ئەوەى كە سۆمەرييەكان و ساميييەكان لە باشوورى ولاتى ميزۆپۆتاميادا نيشتەجێ بن، چەند نەتەوەيەكى تر لەو ناوچانەدا ژياون كە زۆربەى نێوى شارە مێژوويييەكان و تەنانەت نێوى هەردوو رووبارى ديجلە و فوراتيش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو نەتەوانە، چونكە نێوى ئەو رووبارانە نەسۆمەرين و نەسامين، بەڵكو دەگەڕێتەوە بۆ ئەو نەتەوانەى كە لە دەشتى ليتەييدا پێش سۆمەرييەكان واتە لەنێوان هەزارەى شەش و پێنجى پێش زاييندا نيشتەجێ بوون. زاناى ئاركيۆلۆژى (لاندز بێركەر) يەكەم كەس بوو كە دەربارەى ئەم نەتەوانە لێكۆڵينەوەى كردووە و نێوى (فوراتيية

سەرەتاییەکان)ی لێ ناون، ئەوەی شایانی باس بێت ئەم فوراتییە کۆنانە بەپێی رای مامۆستا (گیلێپ) لە سۆمەرییەکان زێتر شارستانییەکەیان رەسەنتر بووە. زۆر لە وشەکانی زمانی ئەم فوراتییە سەرەتاییانە پەڕیونەتە نێو زمانی سۆمەرییەکانەوە کە رەسەنی ئەو وشانە هی فوراتییە سەرەتاییەکانن، لەوانە:

| | | |
|---|---|---|
| ئنگار | ENGAR | جووتیار |
| ئاپن | APN | گاسن |
| نمبار | NIMBAR | دار خورما |
| دەمگار | DAMGAR | بازرگان |
| سمەگ | SIMUG | ئاسنگەر |

لە ئەنجامی خوێندنەوەی ئەو وشانەدا هەست بەنامۆییەکی ئەوتۆ لەگەڵ بەرامبەرەکانیاندا لە زمانی کوردیدا ناکەین. هەروەها چەندین نێوی شارەکانی دەشتی لیتەیی کە لە زمانی سۆمەریدا هەبوون لە راستیدا سۆمەری نین و رەسەنیان دەگەڕێتەوە بۆ زمانی فوراتییە سەرەتاییەکان، لەوانە:

| | | |
|---|---|---|
| ئاریدۆ | ERIDU | (ئەبو شەهرەین)ی ئێستا |
| ئور | URIM | |
| ئۆرۆک | URUK | |
| لارسام | LARSAM | لارسە |
| گرسۆ | GIRSU | |
| لەگاشۆ | LAGASHU | |
| نینا | NINA | |
| شروپاک | SHURUPPAK | |

ئەمانە و چەندین زاراوە و نێوی شار و گوندی تریش، بۆ نموونە هەردوو نێوی دیجلە (ئێدیگنا – IDIGNA) و فورات (بورانون – BU-RANUN)یش بۆ ئەم فوراتییە سەرەتاییانە دەگەڕێنەوە[1]. وشەی بورانون کە فوراتییە سەرەتاییەکان بەرووباری فوراتیان گوتووە، زۆر لە





وشەی (بۆران)ی کوردییەوە نزیکە، دیارە رووباری فورات زستانان بەهۆی بەفر بارانی زۆرەوە لە ئاستی ئاسایی خۆی بەرز دەبێتەوە و لافاوی تێدا هەڵدەستێت، لە کوردەواریی خۆشماندا باوبۆران هەر بۆ ئەو مەبەستە بەکاردێت، جا وشەی بۆرانۆنی فوراتییە سەرەتاییەکان و بۆرانی کوردی هەریەک واتا دەبەخشن کە پێم وایە رەسەنیان دەگەڕێتەوە بۆ زمانی کوردستانییە کۆنەکان. ئەم بەڵگە زمانەوانییە زێتر کوردستانی بوونی فوراتییە سەرەتاییەکانمان بۆ دەردەخات. نێوی ئەو شارانە و سەدانی تریش کە نێوبران لە پێش سۆمەرییەکاندا نیشتەجێی دەشتی لیتەیی بوون بەماوەیەکی دوور، دەربارەی رەسەنی ئەم فوراتییە کۆنانە و یەکەمین نیشتمانیان کە کۆچیان لێوەی کردبێت، لە چیاکانی زاگرۆس و کوردستان بەولاوە هیچ ناوچەیەکی تر نییە، چونکە ئاشکرایە چیاکانی زاگرۆس لە هەموو ناوچەیەکی تر نزیکترە بۆ دەشتی لیتەیی لە باشووری میزۆپۆتامیا، جگە لەوەی کە شارستانێتیی ئەم فوراتییە سەرەتاییانە تارادەیەک شارستانییەکی پێشکەوتوو بووە. ئەگەر بێتو نیشتمانی یەکەمینیان خاوەن شارستانییەکی پێشکەوتوو نەبووبێت هەرگیز نەیان دەتوانی لەو ناوچە تەختانییەدا گوزەران بکەن و ئەو هەموو شارە بنیاد بنێن؟!

مامۆستایان (جین بۆترۆ و ئێلینا کاشن و جین ڤێرکۆتەر) لە کتێبە هاوبەشەکەی خۆیاندا (خۆرهەڵاتی نزیک و شارستانییە کۆنەکان) دەربارەی ئەم فوراتییە سەرەتاییانە دەڵێن: (هەندێک بەڵگەی یەکەمین نیشتمانی ئەم نەتەوانەمان لایە و پاشەڕۆکە مادییەکانیان ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە پەیوەندی رۆشنبیرییان لەگەڵ ولاتی ئیلامدا هەبووبێت، هەروەها لەلایەکی ترەوە ئەم نەتەوانە بەچینەکانی گردی خەڵەفی باکووری میزوپۆتامیاشدا پەیوەندییان هەیە)[2]. بەهەر حاڵ ئیلام بێت یان گردی خەڵەف هەردووکیان دوو ناوچەی چیاکانی زاگرۆسی کوردستانن.

ئەم فوراتییە سەرەتاییانە کشتوکاڵ و ئاودێرییان زانیوە. بێگومان ئەگەر لەوەوبەر باپیرە گەورەیان بەهۆی بارانەوە کشتوکاڵی نەکردبێت ئەستەمە یەکسەر فێری کشتوکاڵ بووبێتن بەرێگەی ئاودێری! چونکە لە

ناوچەی دەشتی لیتەییدا ڕێژەی ئەو بارانەی کە ساڵانە تێیدا دەبارێت بەکەڵکی کشتوکاڵ نایەت و هیچ دانەوێڵەیەکی وا ناهێنێتە بەرهەم کە بتوانن گوزەرانی پێ بکەن. لە ڕاستیدا ئەم فوڕاتییە سەرەتاییانە کشتوکاڵی ئاودێریش هەر لە کوردستانییە کۆنەکانەوە فێربوون.

هەڵکۆڵینەکانی ناوچەی جۆگەمامی، لەلایەن زانایان (دێڤید و جوان ئۆتیس)ەوە ئەوەی دەرخستووە کە هەندێک دانەوێڵە لەم ناوچەیەدا بەشێوەی ئاودێری گەشەی کردووە نەک پشت بەستن بەباران، جگە لەمە هەندێک کەناڵ و ئاوەڕۆگەی بچووکیان لە دەوروبەری هەمان ناوچەدا دۆزیوەتەوە کە تەمەنیان دەگەڕێتەوە بۆ پێش نیشتەجێ بوونی مرۆڤ لە دەشتی لیتەییدا، ئەم کەناڵ و ئاوەڕۆگانە ئەوە دەسەلمێنێت کە کشتوکاڵ چ بەباران و چ بەئاودێری لە ناوچەکانی کوردستانی کۆندا سەری هەڵداوە، تەنها ئەوەیە کە کشتوکاڵی ئاودێری لەلایەن فوڕاتییە سەرەتاییەکان و پاشان لەلایەن سۆمەرییەکانەوە زێتر پێش خراوە بەهۆی نەبوونی بارانی پێویست بۆ ڕووانی کشتوکاڵ لە ناوچەکانیاندا(٣).

بەڵام لە هەمووی گرنگتر ئەو کەرەستە ئارکیۆلۆژیانەیە کە لە ناوچە نیشتەنییەکانی ئەم نەتەوانەدا دۆزراوەتەوە، ئەوی شایانی باس بێت هە چ کەرەستەیەک لە ناوچەکانی زاوی چەمی و چەرموو و جۆگەمامیدا دۆزرابێتەوە لە ناوچەکانی ئەم فوڕاتییە سەرەتاییانەشدا دۆزراوەتەوە، بەڵام بەشێوەیەکی پێشکەوتووتر. دیارە پاش کۆچکردنیان لە کوردستانەوە بۆ ئەم ناوچانە پەرەیان بەکەرەستەکانی ژیان داوە، بۆ نموونە ئەو دەفر و ئامان و گلێنە و فەخفورییانەی لە ناوچەکانی وەک ئاریدۆ و ئور و چەندان شاری تردا دۆزراوەتەوە لە چەشنی فەخفورییەکانی زاوی چەمی و چەرموو و ناوچەکانی تری کوردستانە بەڵام بەشێوەیەکی پێشکەوتووتر و نوێتر واتە تەمەنیان لە فەخفورییەکانی چەرموو و جۆگەمامی کورتترە.

بەڵام گرنگترین بەڵگەی ماددی کە بەتەواوەتی دەیسەلمێنێت کە ئەم فوڕاتییە کۆنانە لە چیاکانی کوردستانەوە کۆچیان کردبێت، ئەوەیە کە ئایینی ئەم فوڕاتییە کۆنانە و ئایینی چیاکانی زاگرۆسی کوردستان یەک







11

چەند پەیکەرێکی خوداوەندی دایک

ئایین بوون، بەڵگەش بۆ ئەمە پەیکەری ئەو خوداوەندە دایکانەیە کە لە ناوچەکانی فوڕاتییە کۆنەکاندا دۆزراونەتەوە بەڵام بەشێوەیەکی پێشکەوتووتر و هونەری تر. ئەم پەیکەرانە کە بۆ چەند مەبەستێکی ئایینی بەکارهێنراون، بەردەوامیی ئەو خوداوەندە دایکانەیە کە لە گوندەکانی زاوی چەمی و چەرمووی کوردستاندا دۆزراونەتەوە. جیاوازیی نێوان ئەم پەیکەرانە تەنها ئەوەیە کە ئەوانەی چیاکانی کوردستان تەمەنیان کۆنترە و هیچی تر.

ئەوەی ئاشکرایە کە هەستی ئایینی هەروەکو لە دواییدا زێتر لەسەری دەدوێم. جێگایەکی تایبەتی لە ژیانی مرۆڤی ئەوکاتەدا هەبووە، لە یەکچوونی ئەم پەیکەرۆکانە کە لە کاروباری پەرستگاکان و مەبەستی ئایینیدا بەکارهێنراون ئەوە دەسەلمێنێت کە پەیوەندییەکی گیانی و پتەو لەنێوان نەتەوەکانی چەرموو و ناوچەکانی تری کوردستان و فوڕاتە

کۆنەکاندا هەبووبێت و لەوێوە بەرەو ناوچەی حەوزی رووباری فوڕات کۆچیان کردبێت.

هەروەها پەرستنی خۆر لەلایەن ئەم فوڕاتییە سەرەتاییانەوە، بەڵگەیەکی تری گرنگە بۆ سەلماندنی رەسەنی ئەم نەتەوانە. هەروەکو لەپێشەوە باس کرا کە (خۆر) هەر لە بەرەبەیانی مێژووەوە لەلایەن مرۆڤی شانەدەر و کوردستانییە کۆنەکانەوە پەرستراوە و پاشان لە گوندەکانی تری کوردستاندا پەرستگای تایبەتی بۆ دروست کراوە. پەرستنی خۆر لەلایەن ئەم فوڕاتییە کۆنانەوە بەردەوامییەکە بۆ ئایینی باب و باپیریان کە پێش چەندین هەزار ساڵ لە چیاکانی کوردستاندا پەرستوویانە و هەر چەندە ئەم فوڕاتییە کۆنانە بەهۆی تاڕادەیەک گەرمیی ناوچەی حەوزی فوڕاتەوە پێویستییەکی ئەوتۆیان بەخۆر نەبووە، بەڵام وەک خوو پێوەگرتنێک و دابونەریتێکی باب و باپیریان خۆریان لە خوداوەندی خۆیاندا بەرجەستە کردووە و پەرستوویانە.

لەبەرئەوەی شارستانی لە ناوچەکانی چیاکانی کوردستاندا و لە سەردەمی زاوی چەمی و چەرموو و چەندان گوندی تردا و هەروەها لە ناوچەکانی فوڕاتە سەرەتاییەکاندا لە پێش سەدە مێژووییەکاندا بووە، واتە پێش ئەوەی سۆمەرییەکان نووسینی مێخی دابهێنن، ناتوانرێت لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی دەربارەی مرۆڤی چەرموو و فوڕاتییە سەرەتاییەکان بکرێت. چونکە زمانەکانیان تا ئێستا لە بازنەی نهێنییەکاندان و تەنها چەند زاراوەیەکی فوڕاتییە کۆنەکان نەبێت کە پەڕیونەتە نێو زمانە سۆمەری و سامییەکانەوە هیچی تر بەدەست زانا ئارکیۆلۆژییەکان نەگەیشتووە. بەڵام بەڵگەی ماددیی ئارکیۆلۆژی وەک کەرەستەی شارستانیی ئەو سەردەمە بەگرنگترین سەرچاوەی مێژوویی دادەنرێت بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر ژیان و شارستانیی ئەو نەتەوە کۆنانە، لەبەرئەوە بەپێی لە یەکچوونی ئەو کەرەستە ئارکیۆلۆژیانەی نێوان مرۆڤی چیاکانی کوردستان و ئەو نەتەوانەی کە بەماوەیەکی کاتی لە دوای ئەوان لە دەشتی لیتەیی باشووری میزۆپۆتامیادا ژیاون و بەتایبەتی پەیکەرەکانی





خوداوەندی دایک کە پەیوەندییەکی گیانیی نێوان ئەو نەتەوانە دەسەلمێنێت و بەیەکەوە گرێیان دەدات، دەتوانین بڵێین: ئەو نەتەوانەی کە پێش سۆمەرییەکان لەو ناوچانەدا ژیاون خاوەن شارستانی بوون و بەفوڕاتییە سەرەتاییەکان نێویان دەرکردووە، هەر ئەو شانەدەرییانەن کە بەرەبەرە بۆ ئەو ناوچانە کۆچیان کردووە و بێگومان نزیکیی هەردوو ئەم ناوچانە لەیەکەوە زێتر راستیی ئەم رایە دەسەلمێنێت.

گواستنەوەی شارستانی لە ناوچەکانی کوردستانەوە بۆ میزۆپۆتامیا و ناوچەکانی باشووری، بۆتە راستییەکی بەڵگە نەویست و لەلایەن زۆربەی زۆری زانایانی ئارکیۆلۆژی و مێژوونووسانی بێگانەوە دانی پێدانراوە، لەوانە پرۆفیسۆر هاری ساکز: سەرۆکی بەشی زمانە سامییەکان لە زانکۆی کاردیفی بریتانی و زانای ئارکیۆلۆژی د. جورج رۆ و مامۆستا مالوان و هەروەها زانایان جین پۆترۆ و ئوسوئاد زارد و ئادەم نکنشیاین و سەدان زانا و مێژوونووسی ئەوروپی تر و هەروەها کۆمەڵەی زانایانی ئارکیۆلۆژیی سۆڤیەتی و ئەمە جگە لە مێژوونووسە عەرەبەکان کە لە سەروو هەموویانەوە مامۆستا تەها باقر باوەڕێکی تەواوی بەگواستنەوەی شارستانی لە کوردستانەوە بۆ باشووری میزۆپۆتامیا هەیە.

### پەراوێزەکانی بەشی سێیەم:

(١) ب. س. پ. لا ٧٧ و ٧٨، تەها باقر.

(٢) ب. لا. ٤٦، جین پۆترۆ، الشرق الأدنى والحضارات المبكرة، موصل، ١٩٨٦ .

(٣) ب. لا. ١٢٣، دێڤید و جوان ئۆتیس، نشوء الحضارة بغداد، ١٩٨٨ .

# بەشی چوارەم

## باشووری میزۆپۆتامیا تا چاخە مێژووییەکان

چیاکانی وڵاتی میزۆپۆتامیا و باکووری، بەشێکن لە زنجیرە چیاکانی زاگرۆسی کوردستان، ئەم زنجیرە چیایانە هەر لە سەرەتای چاخە جیۆلۆجییە کۆنەکانەوە دروست بوون. لە باشووری میزۆپۆتامیادا، واتە لە خوار زنجیرە چیای حەمرینەوە کە ئەمیش بەشێکی زنجیرە چیای زاگرۆسە، بریتییە لە دەشتێکی گەورەی پان و بەرین کە درێژاییەکەی زێتر لە (٦٥٠) کیلۆمەتر دەبێت و بەدەشتی لیتەیی بەنێوبانگە. زانا جیولۆجییەکان دەڵێن کە ئەم ناوچەیە پێش (٦٠) ملیۆن ساڵ یەکپارچە ئاو بووە کە بەنێوی دەریای جیۆلۆجیی (تیتس – TETHYS) نێوی دەرکردووە[1].

باکووری ئەم دەریا جیۆلۆجییە بریتی بووە لە چیاکانی کوردستان. کۆنترین کەناری ئەم دەریایە کە لەلایەن زانایانی جیۆلۆجییەوە دۆزرابێتەوە کەنارەکانی ناوچەی سەنگەسەری نزیک شاری سلێمانییە، پاشان ئەم دەریایە بەرەبەرە پاش چەندین ملیۆن ساڵ بەهۆی ئەو قوڕ و لیتەیەی کە هەردوو رووباری دیجلە و فورات و لکەکانیان لە کاتی لافاودا هێناویانە، دەشتی لیتەیی دروست بووە کە مێژووی ئەم دەشتە لیتەییە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی بلایستۆسین. پاشان کەناری ئەم دەریایە زێتر بەرەو خوار چووە، هەتا ناوچەکانی (بەلەد و سامەڕا) کە لەوێش کەنارەکانی دۆزراوەتەوە[2].

ئەو رایانەی کە لەپێشەوە باس کران کورتەی تیۆرییەکەی زانای ئارکیۆلۆژیی بەنێوبانگ (دی مۆرگان)ە. لەپاش ساڵی ١٩٥٠وە ئەم تیۆرییەی دی مۆرگان کەوتە بەر رەخنەی زانا جیۆلۆجییەکان، لەوانە (لیز و ڤاڵکۆن و رایت) کە ئەمان لەو بڕوایەدا بوون کە کەناری کەنداوەکە بەو شێوەیە وا دوور نەکەوتۆتەوە، بەڵکو هەر لە دەوروبەری ئەو ناوچانەی کەنارەکانی ئێستایدا بووە، بەڵام تاوەکو ئێستا بەتەواوەتی ساغ نەبووەتەوە ئایا کام تیۆرییەیان بەتەواوەتی راستە. چونکە زانا





جیۆلۆجییەکان وای بۆ دەچن کە ئەو کەنارانەی کە لە ناوچەکانی سەنگەسەر و بەلەد و سامەڕادا دۆزراونەتەوە، کەناری کەنداوەکە نییە، بەڵکو بریتییە لە ڕێڕەوە کۆنەکانی رووباری دیجلە.

هەرچۆنێک بێت تیۆرییەکەی دی مۆرگان ناتوانرێت بەتەواوەتی بەدرۆ بخرێتەوە چونکە چەندین بەڵگەی ماددی و زانستی پشتگیریی دەکات، لەوانە:

١- ڕێژەی ئەو قوڕ و لیتەیەی کە ساڵانە هەردوو رووباری دیجلە و فورات لە چیاکانی کوردستانەوە دەیهێنێت بە(١٠) بلیۆن تۆن دادەنرێت، ئەم ڕێژەیە پێنج ئەوەندەی ئەو قوڕ و لیتەیەیە کە رووباری نیل لە ماوەی یەک ساڵدا دەیهێنێت. ئەوەی شایانی باس بێت تەمەنی هەردوو رووباری دیجلە و فورات ملیۆنەها ساڵە، وابزانم ئەم تەمەنە ماوەیەکی باشە بۆ پڕبوونەوەی دەریای تیتسی جیۆلۆجی. باشە ئەگەر دەشتی لیتەیی ئێستا، کاتی خۆی دەریا نەبووبێت! ئەو هەموو قوڕ و لیتەیە چیی بەسەر هات؟!...

٢- بوونی ڕێژەیەک لە پەترۆڵی زۆر لە ناوچەکەدا ئەوە دەسەلمێنێت کە کاتی خۆی ئەم ناوچانە دەریابوون و چەندەها گیانەوەری مەزنی ئاویی دایناسۆر ئاسای تێدا ژیاوە و زستانان بوون بەژێر قوڕ و لیتەی هەردوو رووبارەکەوە و لە ئەنجامی پەستان و گەرماییەکی زۆردا بوونەتە پەترۆڵ. لێکۆڵینەوە جیۆلۆجییەکانی ئەم سەردەمە سەلماندوویانە کە پەترۆڵ لە ئەنجامی پەستان و گەرمایی زەوییەوە پەیدا دەبێت، کە دەیخاتە سەر ئەو گیاندار و دار و درەختانەی کە بەهۆی گۆڕانە سروشتییەکانەوە دەکەونە ژێر زەوی. دیارە هیچ بەڵگەیەکی جیۆلۆجیی ئەوتۆش بەدەستەوە نییە کە ناوچەی دەشتی لیتەیی لە کۆندا جەنگەڵستان بووبێت، هەروەکو جەنگەڵستانە کۆنەکانی ناوچەی باکۆی ئازربایجان، کە بوونەتە هۆی دروستبوونی پەترۆڵێکی بێ ژمار لەو ناوچانەدا.

کەواتە ئەو پەترۆڵە زۆرەی کە لە ناوچەی دەشتە لیتەییەکانی باشووری

میزۆپۆتامیادا هەیە لە ئەنجامی گیانەوەرە مەزنەکانی دەریای تیثسی جیۆلۆجییەوە دروست بووە.

٣- بوونی ئەو هەموو هۆڕ و زەلکاوانەی دەشتی لیتەیی زێتر راستیی تیۆرییەکەی دی مۆرگان دەسەلمێنێت. وەکو هۆڕی حەممار و حوێزە و چەندانی تر، ئەوە دەگەیەنێت کە ئەم ناوچانە کاتی خۆی هەمووی ئاو بوون و ئەم زەلکاوانەش پاشماوەی ئەو دەریا جیۆلۆجییەن کە تاوەکو ئێستێ پڕ نەبوونەتەوە.

٤- دووری ئەو کەنارانەی کە دۆزراونەتەوە بەتایبەتی کەناری سەنگەسەر لە ڕێڕەوی ئێستای ڕووباری دیجلەوە کە سەدان کیلۆمەتر لێوەی دوورە، رای ئەو زانا جیۆلۆجییانە بێ هێز دەکات کە رەخنەی لە تیۆرییەکەی دی مۆرگان دەگرن.

٥- نەدۆزرانەوەی هیچ کەرەستەیەکی شارستانی کە هاوکات بێت لەگەڵ ئەشکەوت و ناوچەکانی تری کوردستاندا، زێتر رایەکەی دی مۆرگان پتەوتر دەکات و ئەوە دەسەلمێنێت کە ناوچەکە کاتی خۆی ئاو بوویێت. تەنانەت ئێسکی گیاندارێکی کێویشی لێ نەدۆزراوەتەوە کە تەمەنی بگەڕێتەوە بۆ چاخە جیۆلۆجییە کۆنەکان. لەم بارەیەوە پرۆفیسۆر هاری ساکز دەڵێت: هیچ بەڵگەیەکی ئەوتۆ بەدەستەوە نییە کە لە چاخی بەردینی کۆن و نوێدا مرۆڤی کۆن نیشتەجێی دەشتی لیتەیی بوویێت، بەڵام ئەو تەنها پارچەیەی کە دەگەڕێتەوە بۆ چاخی بەردینی کۆن کە لە ناوچەی حەوزی دەریاچە کۆنەکەی نزیک کەربەلاوە دۆزراوەتەوە، بەهۆی لافاوی ئاوی فوراتەوە لە چاخی بەردینی کۆندا گوێزراوەتەوە بۆ ئەو دەریاچەیە و مرۆڤی کۆن لە چاخە بەردینەکاندا لەم ناوچەیەدا تەنها لە ئەشکەوتەکانی باکووری دەشتی لیتەییدا - واتە کوردستان - ژیاوە[٣].

٦- تیۆرێکی جیۆلۆجیی تر دەربارەی ئەم کەنداوە هەیە کە دەڵێت، لە کۆندا هەردوو ڕووباری دیجلە و فورات بەیەکەوە نەڕژاونەتە نێو کەنداوەکەوە، هەروەکو چۆن ئێستێ ئەم دوو ڕووبارە بەهۆی (شەت





ئەلعەرەب)ەوە لە قوڕنە بەیەکەوە دەڕژێنە ناوی. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە کاتی خۆی کەناری کەنداوەکە کەوتووەتە باکووری قوڕنەوە، ئەم تیۆرییە زێتر راستیی تیۆرییەکەی دی مۆرگان دەسەلمێنێت.

٧- هەروەها لە لیستی پادشا سۆمەرییەکاندا ئەوە هاتووە کە کەناری دەریاکە لاپاڵی چیاکان بووە، کە ئەم چیایانەش هەر دەبێت زاگرۆسی کوردستان بێت[٤].

دەربارەی دروستبوونی دەشتی لیتەیی ئێمە لە بەردەم ئەو دوو تیۆرییە داین، تیۆری (دی مۆرگان)و تیۆری (لیز و هاوبیرانی). بەپێی تیۆری دی مۆرگان ناوچەکە کاتی خۆی دەریا بووە، لە ئەنجامی قوڕ و لیتەی هەردوو ڕووبارەکەوە وردە وردە کەناری دەریاکە بەرەو خوار بووەتەوە و پاشان گیانەوەر و ئاژەڵی ناوچە شاخاوییەکانیش لەگەڵ کەنارەکەدا بەرەو خوار بوونەتەوە، ئینجا مرۆڤی ئەو ناوچانەش بەمەبەستی وەدەستخستنی شوێنێکی باشتر بۆ گوزەرانیان لەو دەشتە نوێیانەدا نیشتەجێ بوون، بەم مرۆڤانە دەگوترێت فوراتییە سەرەتاییەکان.

بەڵام بەپێی رای لیز و هاوبیرانی کە دەڵێن کەناری کەنداوەکە بەرەو خوار نەچووە، بەڵکو بەپێچەوانەوە لە ئەنجامی گواستنەوەی ئەو هەموو قوڕ و لیتەیەدا کەناری کەنداوەکە زیاتر بەرەو سەرەوە هاتووە. خۆ ئەگەر واش بێت ئەوا سەرکەوتنی کەناری کەنداوەکە رێی لە مرۆڤی چیاکانی زاگرۆس نەگرتووە کە بەرەو پێ دەشتەکان کۆچ بکەن، هەرچۆنێک بێت لە دەوروبەری هەزارەی پێنجەمی پ.ز. دا ئەو مرۆڤە چیاییانە بەرەو خوار بوونەتەوە و لە ناوچەی حەوزی فوراتدا نیشتەجێ بوون، تا بەرە بەرە بەتەواوەتی لە دەشتی لیتەییدا بڵاوبوونەتەوە. ئەوەی شایانی باسە و هەروەکو لە پێشەوە باس کرا ئەو زاراوانە و نێوی ئەو شارانەی کە دەگەڕێتەوە بۆ زمانی ئەم فوراتییە سەرەتاییانە نە سۆمەرین و نە سامی، چونکە ئەم دوو نەتەوەیە یاخود ئەم دوو رەگەزە لەپاش هەزارەی پێنجی پ.ز. وە لە دەشتی لیتەییدا نیشتەجێ بوون و بەشدارییی فوراتییە کۆنەکانیان کردووە لە شارستانێتی میزۆپۆتامیای کۆندا. لەبەرئەوە هیچ

نەتەوەیەک نییە وەک نەتەوەکانی چیاکانی کوردستان خاوەن بەڵگەی ماددی ئارکیۆلۆژی بێت بۆ ئەوەی ببنە باپیرە هەرە گەورەی فوراتییە سەرەتاییەکان. ئەم فوراتییە سەرەتاییانە تاوەکو چاخە مێژووییەکان بەتەواوی لە دەشتەکاندا مانەوە، لەپاش هاتنی سۆمەرییەکان و زێتر گەشەکردنی شارستانیی ناوچەکە لەسەر دەستیاندا، ئەم فوراتییە سەرەتاییانە لە بۆتەی ئەم سۆمەرییانەدا توانەوە و بوونە بەشێک لێیان، بەرادەیەک کە زمانەکەی خۆشیان بیرچووەوە. تەنها چەند زاراوە و نێوی چەند شارێک نەبێت کە ئەویش بەهۆی پەرینی ئەو زاراوانە بۆ زمانی سۆمەری و زمانە سامییەکان بەدەست ئێمە گەیشتوون.

بەڵام دەتوانین بڵێین کە دابونەریتی ئەم فوراتییە سەرەتاییانە کارێکی تەواوی کردە سەر سۆمەرییەکان، بەتایبەتی لە کاروباری ئایینیدا و پەرستنی خوداوەندی دایک و خوداوەندی خۆر لەلایەن سۆمەرییەکانەوە باشترین بەڵگەن بۆ ئەم کارتێکردنە، ئەگەرچی سۆمەرییەکانیش خۆیان لە رەسەندا خاوەنی ئەم باوەڕانە نەبووبێتن، هەروەکو لە دواییدا باسیان لێوە دەکەم.

**پەراوێزەکانی بەشی چوارەم:**

(١) ب. س. پ. لا، ١٥ تەها باقر.
(٢) ب. س. پ. لا، ١٨ تەها باقر.
(٣) ب. س. پ. لا، ٣٦ هاری ساکز.
(٤) ب. س. پ. لا، ٣٥، SAMUEL NOAH KRAMER.



# بەشی پێنجەم

## کێشەی سۆمەرییەکان و رای زانایانی ئارکیۆلۆژی

لە راستیدا زانیاری دەربارەی سۆمەرییەکان، کە بەشدارییەکی زۆر مەزنیان لە دروستکردنی شارستانیی دۆڵی رافیدەیندا کردووە درەنگ بەدەرکەوت، ئەگەر بێت و بەراوردیان بکەین لەگەڵ ئاشوورییەکاندا. هۆی ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە یەکەم پشکنین و هەڵکۆڵین کە لە عێراقی ئێستادا کرابێت لە پایتەختەکانی ئاشووردا کراوە، وەک نەینەوا و نەمرود[١].

لە نێوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمەوە و لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەکانی رۆژهەڵاتناسی بەنێوبانگ (هتکس)ەوە هێماکانی نووسینی مێخیی سەر هەندێک تەختەگڵ و نووسراوە بەنێوبانگەکەی کێوی بێستون خوێندرایەوە، ئەم کارەی هتکس، بەکۆدێتایەک دادەنرێت لە زانستی مێژوودا، بەتایبەتی مێژووی کۆن و سەردەمی نووسینی مێخی. پاشان چەندین زانای تر پەرەیان بەخوێندنەوە و پەرچڤەکردنی ئەم تەختە گڵانە دا بۆ زمانە ئەوروپییەکان و بەهۆیانەوە زۆربەی گرێ کوێرە مێژووییە کۆنەکانی دۆزرایەوە و جگە لە تێکستە ئەدەبی و ئایینییەکان کە وەک ئاوێنەیەک وایە بۆ ژیانی رۆژانەی سۆمەرییەکان و ئەو نەتەوانەی کە پاش ئەمان لە ناوچەکەدا ژیاون.

هتکسی رۆژهەڵاتناس لەپێشدا لەو بڕوایەدا بوو کە زمانی ئەو تەختە گڵانەی کە مێژوویان بۆ پێش بابلی و ئاشوورییەکان دەگەڕێتەوە سامی بێت، بەڵام پاش دوو ساڵ پرۆفیسۆر (رۆڵنسن) ئەوەی ئاشکرا کرد کە هەندێک لەو تەختە گڵانەی کە لە گردی قۆینجەقدا دۆزراوەتەوە بەدوو زمان نووسراون، زمانێکیان ئاشوورییە و ئەوی دیان لە کاتی خۆیدا هەندێک نێوی هەڵەی لێ نرا.

هەرچۆنێک بێت نێوی ئەو زمانە نادیارە نەدۆزرایەوە تاوەکو ساڵی

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| 1 | | | | | باڵندە |
| 2 | | | | | ماسی |
| 3 | | | | | کەر |
| 4 | | | | | گا |
| 5 | | | | | خۆر |
| 6 | | | | | دانەوێڵە |
| 7 | | | | | باخچە |
| 8 | | | | | گاسن |
| 9 | | | | | تیروکەوان |
| 10 | | | | | ڕۆیشتن |

12 قۆناغەکانی گۆڕانی نووسینی مێخی

١٨٦٩. (ئەبرت)ی ڕۆژهەڵاتناس پاش خوێندنەوەی چەند تەختە گڵێک و بوونی نازنێوی (پاشای سۆمەر و ئەکەد) لەو نووسینە مێخییانەدا وای لێکدایەوە کە وشەی (ئەکەد) سامییەکان دەگەیەنێت جا ئەگەر بابلییەکان بن یاخود ئاشوورییەکان، لە کاتێکدا کە وشەی (سۆمەر) ئەوە دەگەیەنێت





کە گەلێکی نا سامی بن و ئەو زمانە نوێیەی کە لەسەر تەختە گڵەکانە بۆ ئەو گەلە دەگەڕێتەوە[٢]. بەو شێوەیە نێوی (سۆمەر و سۆمەرییەکان) جارێکی تر بۆ مێژوو گەڕایەوە پاش ئەوەی بۆ ماوەی چەند سەدەیەکی درێژ چووبوونە دەریای بیرچوونەوە.

هۆی ونبوون و لە بیرچوونەوەی نێوی (سۆمەر) دەگەڕێتەوە بۆ بارودۆخی سۆمەرییەکان خۆیان لە سەدە کۆنەکاندا. چونکە زانایانی زمانی سۆمەری دەڵێن کە لە سەردەمی بابلیی کۆنەوە و لە ئەنجامی ڕووخانی بنەماڵەی سۆمەرییەکانەوە زمانەکەشیان بەرەو نەمان چووە، دوا بنەماڵەی سۆمەرییەکان، بنەماڵەی ئوری سێیەم بوو کە لە دەوروبەری (٢٠٠٤) پ.ز دا کۆتایی هات.

تەورات کتێبی پیرۆزی جوولەکەکان. وەک سەرچاوەیەکی مێژوویی کۆن هەر لە دەمێکەوە مێژوونووسان بەکاریان هێناوە، لەبەرئەوەی نێوی زۆربەی شارەکان و پادشا کۆنەکانی ڕۆژهەڵاتی نزیکی تێدا هاتووە، بەڵام ئەم کتێبە بەهیچ جۆرێک نێوی سۆمەرییەکانی نەبردووە، تاکە وشە کە لە سۆمەرەوە نزیک بێت و لە تەوراتدا هەبێت وشەی (شنعار)ە کە ئەویش لەو بڕوایە دام پەیوەندیی بەسۆمەر و سۆمەرییەکانەوە نەبێت. ئەم وشەیە زۆر لە (ژەنگار - شنگار)ەوە نزیکە، کە هەر لە کۆنەوە نیشتمانی کوردە یەزیدییەکان بووە. بەڵام هەر لە تەوراتدا زاراوەی (کوش) هاتووە کە مەبەست لە کاشییەکانە و ڕەگەزێکی کۆنە کە لە کوردستاندا ژیاون.

هەر لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمەوە و پاش دۆزینەوەی نێوی سۆمەر و پەی پێ بردنی هێمای زمانەکەیان، کەڵکەڵەی زانینی ڕەسەنی ئەم سۆمەرییانە کەوتە مێشکی زانا ئارکیۆلۆژی و مێژوونووسانەوە، چەندین پرسیار دەهاتە کایەوە، سۆمەرییەکان کێن؟ ڕەسەن و یەکەمین نیشتمانی دایک زادەیان کوێ بووە؟ زمانەکەیان سەر بەکام گرووپی کۆمەڵە زمانەکانە؟ ئایا هەر لە کۆنەوە لە دەشتی لیتەییدا ژیاون یان نا؟ سۆمەرییەکان سامین یاخود ئاری یان هەر ڕەگەزێکی تر؟ و چەندان پرسیاری تر، هەتا ئەم مەسەلەیە وای لێ هات نێوی نرا (کێشەی

سۆمەرییەکان) و لەلای هەندێکی تر بووە (سەیر و سەمەرەی سۆمەر) و هەندێک لە زانایان وایان لێ هات کە بڵێن دۆزینەوەی رەسەنی سۆمەرییەکان کارێکی بێ هوودەیە...؟!. هێندێکی تر دەیان گوت سۆمەر لە بنەڕەتدا بوونی نییە. زانایانی ئاڕکیۆلۆژی و ئەو مێژوونووسانەی کە لە مێژووی کۆنی ناوچەی خۆرهەڵاتی نزیکدا پسپۆڕن هەموویان لەسەر ئەوە رێککەوتوون کە سۆمەرییەکان رەگەزێکی سامی نین.

هێندێک لە مێژوونووسان دەڵێن کە سۆمەرییەکان کاتی خۆی لە ناوچەکانی دۆڵی (سند)ی هیندستانەوە بەئێران و ناوچەی کەنداودا کۆچیان کردووە و نیشتەجێی دەشتی لیتەیی بوون[٣]. هەروەها هێندێکی تریان رەسەنیان دەگەڕێننەوە بۆ باشووری بلوخستان[٤].

ئەوەی وای لەو مێژوونووسانە کردووە کە رەسەنی سۆمەرییەکان بەرنەوە سەر دۆڵی سند کە نەتەوەکانی هەراپای تێدا ژیاوە، لە یەکچوونی ئەو کەرەستە هونەری و شارستانییانەیە کە لە هەردوو ناوچەکەدا دۆزراوەتەوە، بەڵام پەیوەندیی زمانەوانیی نێوان سۆمەرییەکان و ناوچەی دۆڵی سند هێشتا روون نەبۆتەوە بەهۆی نەدۆزینەوەی هێماکانی نووسینی ئەم ناوچەیە.

دەربارەی بردنەوەی رەسەنی سۆمەرییەکان بۆ ناوچەکانی دۆڵی سند، پرۆفیسۆر پاکیزە رەفیق حیلمی دەڵێت: ساخ بۆتەوە کە ئارییە هیندییەکانی هندستان کە زمانەکەیان ناونراوە (سانسکریتی) سۆمەری بوون و لە وڵاتی سۆمەرەوە چوون بۆ هندستان نەک بەپێچەوانەی ئەوە. و ئەمە بەبەڵگە ئاڕکیۆلۆجی و فیلۆلۆجییەوە تۆمارکراوە. کە لە هەزارەی سێیەمدا سۆمەرییەکان بەبۆنەی - بازرگانییەوە - بەدەریادا چوون بۆ هندستان لە دۆڵی (سندو)دا ئاوەدانییێکی سەر بەئارییان دامەزراندووە، دوای ئەوە هەر بەشێک لە نەتەوە ئارییەکان کە لام وایە (ماد) بوون لە هەزارەی دووەمدا لە ئەفغانستانەوە دیسان چوون بۆ هندستان و لەوێدا بەناوی (ئاری)یەوە ژیاون کە لەو دەمەدا ئیتر هەموو نەتەوە ئارییەکان ناسراون وەک میتانی و خوری و، زمانی ئەم ئارییانە بوو کە ناونرا





سانسکریتی و بوو بەهۆی دۆزینەوەی خزمایەتی زمانە ئارییەکان و دابەشکردنی زمانان بەگوێرەی ئەو خزمایەتییە ناونانی زمانە هندوئەوروپاییەکان کە من ناوم نان (ئاریا ئەوروپی)[٥].

لە ساڵی ١٩٧٤ دکتۆر (بەندەک) لە زانکۆی (پۆینس ئیرس) لە کتێبەکەیدا بەنێونیشانی (الاعجوبة السومرية - سەیر و سەمەرەی سۆمەرییەکان)دا لە رەسەنی سۆمەرییەکان دواوە، کە زۆر بەڕاشکاوییەوە دەڵێت سۆمەرییەکان لە هەنگارياوە کۆچیان بۆ دەشتی لیتەیی کردووە و لە هەمووی سەیرتر ئەوەیە کە لە کتێبەکەیدا لیستەیەکی تێدایە کە دەیان زاراوەی سۆمەریی تیا کۆکردووەتەوە کە لە زمانی هەنگاریشدا بەهەمان واتا و بەهەمان فۆنەتیک بەکار دەهێنرێن، د. بەندەک لە کتێبەکەیدا نەخشەیەکیشی دروست کردووە کە تێیدا کۆچکردنی سۆمەرییەکان دەردەخات لە ناوچەکانی هەنگاریا و رۆماندا بۆ ئەنەدۆڵ و باکووری فوڕات و پاشان دابەزینیان بۆ دەشتی لیتەیی کە بەوڵاتی سۆمەر ناسراوە[٦].

هێندێکی تر لە زانایان سۆمەرییەکان دەبەنەوە سەر نەتەوەی باسک و چەند بەڵگەیەکی بێ هێزی زمانەوانیشی بۆ دێننەوە، ئەوەی شایانی باس بێت هەموو ئەو رایانە کە باس کران هیچیان جێی بڕوا و متمانە نین چونکە ساغکردنەوەی دۆزێکی وا پێویستیی بەزۆر بەڵگەی مادیی بنەبڕ هەیە کە ئەو کێشەیە یەکالا بکاتەوە، تەنانەت ئەو زانایانەی کە خاوەنی ئەو رایە باسکراوانەن خۆشیان گومانیان لە راکانیان هەیە و دوودڵن لێی. رەسەنی سۆمەرییەکان یاخود کێشەی سۆمەرییەکان وای لێ هاتووە کە خۆرهەڵاتناسی بەنێوبانگ (H. FRANKFOOT) بڵێت: لێکۆڵینەوە و گفتوگۆ لەسەر ئەم کێشەیە لەوانەیە لە کۆتاییدا ببێتە شوێنکەوتنی ئەندێشە و تەراویلکە کە بەهیچ جۆرێک بوونی نییە![٧].

بەڵام ئەم رایەی کە زۆرترینی هەموو مێژوونووس و ئاڕکیۆلۆژییەکانی جیهان لەسەری رێککەوتن ئەوەیە کە رەسەنی سۆمەرییەکان دەبەنەوە سەر چیاکانی زاگرۆسی کوردستان. ئەم رایەی کە رەسەنی سۆمەرییەکانی دەبردرێتەوە سەر زێتر لە هەموو رایەکانی دیکە لەگەڵ راستیدا دەگونجێت

بەهۆی ئەو بەڵگە مادی و گیانی و کەرەستە ئارکیۆلۆژییانەی پشتگیریی ئەم رایە دەکەن هەروەکو لە کۆتایی ئەم باسەدا بەدرێژی باسیان لێوە دەکەم.

زانای بەنێوبانگی ئارکیۆلۆژی: جۆرج رۆ دەربارەی ئەم مەسەلەیە دەڵێت «دانیشتوانی (عەبید) وا دەردەکەوێت کە لە ئێرانەوە هاتبن – دیارە مەبەستی باکووری خۆرئاوا و خۆرئاوای ئێرانە کە کوردستانی بن دەستی ئێرانە – هەروەها هەندێک بەڵگە هەیە ئەوە دەردەخات کە لە باکووری عێراقەوە (باشووری کوردستان)ەوە هاتبن و ناوچەکەیان گرتووە و یاساکانی خۆیانیان بەسەر دانیشتوانە هەرە کۆنەکانی ئەم ناوچانەدا سەپاندووە. لەلایەکی ترەوە فەخفورییەکانی ئاریدۆ ئەوە دەردەخات کە دانیشتوانە سەرەتاییەکانی باشووری عێراق رەسەنیان دەگەڕێتەوە بۆ عەبید و خەڵەفییەکانی باکوور، – مەبەستی باشووری کوردستانە – پاشان دەڵێت: بەدڵنیاییەوە خەڵەفییەکان بریتین لە کشتیارەکانی حەسوونە و چەرمووی چاخی بەردینی نوێ کە کۆچیان بۆ ئەو ناوچانە کردووە»[٨].

هەروەها پرۆفیسۆری بەنێوبانگ هاری ساکز دەڵێت: «لە کۆتایی چاخەکانی پێش مێژوو و چاخە مێژووییەکان، سۆمەرییەکان لە خۆرهەڵات و باکووری خۆرهەڵاتەوە هاتوونەتە باشووری وڵاتی بابلەوە»، دیارە مەبەستی (خۆرهەڵات) بەتەنها ناوچەکانی خۆرئاوای ئێرانی ئێستا بووە و کە پێی دەگوترێت ئیلام و ئێستاش بەلورستان و لەکستان نێوی دەرکردووە کە دوو هەرێمی گەورەی باشووری خۆرهەڵاتی کوردستانن. پاشان پرۆفیسۆر هەندێک بەڵگەی مادی بۆ راکەی دەهێنێتەوە کە لە دواییدا لێیان دەدوێم و گرنگترینی ئەو بەڵگانە بۆ رەسەنی سۆمەرییەکان پەرستگای زەکورەیە[٩].

دکتۆر فەوزی رەشید: مامۆستای زمانی سۆمەری لە کتێبەکەی خۆیدا (رێزمانی سۆمەری) دەڵێت «ئێمە لەو بڕوایەداین کە سۆمەرییەکان هەر دانیشتوانی بەشە باکوورییەکانی عێراق بن – مەبەستی باشووری کوردستانە – و هاتوونەتە ناوچەکانی باشوور و بەشێوەی کۆمەڵ کۆمەڵ و





بەهۆی زۆربوونی دانیشتوانی بەشە باکوورییەکان کوردستان – لەکاتی هەردوو شارستانیی سامەڕا و خەڵەف، کە رێژەی کەرەستە خۆراکییەکان بەشی نەکردوون کە ناوچەکە هێناویەتییە بەرهەم، بووەتە هۆی ئەوەی کە ئەم زێدە دانیشتوانانە بەرەو باشوور کۆچ بکەن»[١٠].

هەروەها دکتۆر سوبحی ئەنوەر رەشیدیش، دەڵێت «پاشەڕۆکە ئارکیۆلۆژییەکان سەلماندوویەتی کە ئەمانە – سۆمەرییەکان – رەسەنیان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو نەتەوانەی کە لە چاخەکانی پێش مێژووەوە لە عێراقدا ژیاون – دیارە مەبەستی بەشی باکوورێتی کە ئەویش کوردستانە – و لە چاخە مێژووییەکاندا بەسۆمەرییەکان ناسراون بەهۆی ئەو شوێنە جوگرافییەی کە تێیدا کۆبوونەتەوە لە بەشی باشووری عێراقدا»[١١].

دکتۆر یوسف حوبیش، لە کتێبەکەیدا (مرۆڤ لە ئەدەبی دۆڵی رافیدەین)دا دەڵێت «هەڵبەتە رەسەنی سۆمەرییەکان چیاکانە، لەبەرئەوەی جلەکانیان خوری بووە و پیشەسازیشیان لە مس بووە»[١٢].

پسپۆڕی ئارکیۆلۆژی (هندکۆک) لە کتێبەکەی خۆیدا (شوێنەوارەکانی دۆڵی رافیدەین)، رەسەنی سۆمەرییەکان دەباتەوە سەر ناوچەی ئیلام. واتە چیاکانی زاگرۆسی خۆرهەڵاتی کوردستان[١٣]. پاشان دەڵێت: «سۆمەرییەکان و ئیلامییەکان بەزمانێک گفتوگۆ دەکەن کە سامی نییە و هەردوولایان فەرهەنگیان هەبووە و هەردوولایان نووسینی مێخییان بەکارهێناوە»[١٤].

هەروەها مامۆستا (لون) لە کتێبەکەی خۆیدا (چیرۆکی مرۆڤ)، دەڵێت «... لەپاش چەند ساڵێک و – دوای لافاوە مەزنەکە – سۆمەرییەکان لە باکوورەوە – لە کوردستانەوە – هاتن. ئەمانە لە توخمی سپین و کاتی خۆی لە چیاکاندا نیشتەجێ بوون، وا راهاتوون کە خوداوەندەکانیان لەسەر لووتکەی گردەکان (زەکورەکان) بپەرستن و پەرستگاکانیان لەسەر دروست بکەن».

پرۆفیسۆر فازیل عەبدولواحید عەلی، مامۆستای سۆمەرییەکان لە کۆلیجی ئادابی زانکۆی بەغدا دەربارەی رەسەنی سۆمەرییەکان دەڵێت:

«ئێمە وای دەبینین کە سۆمەرییەکان بەردەوامیی ئەو نەتەوانە بن کە لە چاخەکانی پێش مێژووەوە لە دۆڵی رافیدەیندا نیشتەجێ بوون کە لە باکووری وڵاتەوە – مەبەستی باشووری کوردستانە – بەرەو باشوور بەرەو خوار بوونەتەوە و لەو ناوچەیەدا کەوا راستترە نێوی سۆمەریی پێ بگوترێت نیشتەجێ بوون کە سۆمەرییەکان خۆشیان بەنێوی ئەو شوێنەوە ناسراون لە چاخە مێژووییەکانی دواییدا»(١٥).

هەروەها دکتۆر سامی سەعید ئەحمەد لە کتێبەکەی خۆیدا دەربارەی رەسەنی سۆمەرییەکان دەڵێت: «سۆمەرییەکان دانیشتوانی عێراق خۆیین کە لە ناوچەکانی باکوور – مەبەستی باشووری کوردستانە – نیشتەجێ بوون پێش ئەوەی بەرەو باشوور کۆچ بکەن»(١٦).

زانا کوردەکان کەسی وایان لە رەسەنی ئەم سۆمەرییانە نەدواون، تەنها پرۆفیسۆری زانیاریی زمان د. پاکیزە رەفیق حیلمی نەبێت کە لە لێکۆڵینەوەکەی خۆیدا دەربارەی سۆمەرییەکان نەک هەر دەیانباتەوە سەر چیاکانی کوردستان، بەڵکو باسی ئاری بوونی ئەم سۆمەرییانەش دەکات(١٧). دەربارەی ئاری بوونی ئەم سۆمەرییەکان، هەرچەندە چەند بەڵگەیەکی بەهێز پشتگیریی ناکات! بەڵام پێش د. پاکیزە، مامۆستا (وادن)ی زانکۆی لەندەنیش، هەر رای وابووە کە سۆمەرییەکان ئاری رەگەز بوون(١٨).

ئەو رایانەی کە باس کران، مشتێک لە خەرواری ئەو زانایانەیە کە بەبڕواوە رەسەنی سۆمەرییەکان دەبەنەوە سەر چیاکانی کوردستان. بێگومان هەر یەک لەمانە راکانی خۆیان بەچەندەها بەڵگەی مادی و مێژوویی بەهێز کردووە، هەرچەندە بەتەواوەتی راستیی ئەو مەسەلەیە یەکالا نەبووەتەوە، بەڵام دەتوانین بڵێین کە ئەو بەڵگانەی کە گەواهی بۆ ئەوە دەدەن کە سۆمەرییەکان رەسەنیان دەچێتەوە سەر چیاکانی کوردستان زۆر بەهێز و زێترە لەو بەڵگانەی کە سۆمەرییەکان دەبەنەوە سەر ناوچەیەکی تر یاخود هیچ نەبێت بەرپەرچی رەسەنی سۆمەرییەکان دەدەنەوە لە چیاکانی کوردستاندا.





سۆمەرییەکان بەماوەیەک لە پێش چاخە مێژووییەکاندا لە دەشتی لیتەییدا دەرکەوتوون و بێگومان خودی خۆشیان پاش داهێنانی نووسین لە رەسەن و نیشتمانی خۆیان بەتەواوەتی نەدواون و ئاشکرایان نەکردووە، تەنها ئەوە نەبێت کە (چیا)یان زۆر لە لا پیرۆز بووە، هەروەکو لە هەندێک نووسینی تەختە گڵەکانیاندا دەردەکەوێت، لەبەرئەوە هەر یەکێک بیەوێت لە رەسەنی سۆمەرییەکان بکۆڵێتەوە دەبێت پەنابەرێتە بەر چەند بەڵگەیەکی مادی و کەرەستە ئارکیۆلۆژییەکان و هەستی ئایینیان و پێکهاتنی بایۆلۆژییان و چەند شتی مادیی تر. ئەمە جگە لە هۆکاری جیۆگرافیی ناوچەکە کە ئەویش تیشکێک دەخاتە سەر نیشتمانی یەکەمینی سۆمەرییەکان هەروەکو لە دواییدا تەواوی ئەو بەڵگانە باس دەکرێت.

**پەراوێزەکانی بەشی پێنجەم:**

(١) ب. لا، ٤٤٤ العراق في موكب الحضارة، اعداد نخبة من أساتذة التاريخ، الجزء الاول، بغداد، ١٩٨٨.
(٢) ب. لا، ٢٢، د. فاضل عبدالواحد علي، من الواح سومر الى التوراة، بغداد، ١٩٨٩.
(٣) ب. س. پ. لا، ٦٧–٦٨، العراق في التاريخ.
(٤) ب. س. پ. لا، ٥٣، د. هاري ساكز.
(٥) ب. لا، ٢١٤، د. پاكیزە رەفیق حیلمی، گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژمارە، ١١٣.
(٦) ب. س. پ. لا، ٢٧، د. فاضل عبدالواحد علي.
(٧) ب. س.پ. لا، ١٢٣ جۆرج رۆ.
(٨) ب. س. پ. لا، ١٢٣.
(٩) ب. س. پ. لا، ٥٣، د. هاري ساكز.
(١٠) ب. لا، ٢٦، د. فوزي رشيد، قواعد اللغة السومرية.
(١١) ب. س. پ. لا، ٤٤٥، العراق في موكب الحضارة.
(١٢) ب. لا، ٤٥، د. يوسف حبي، الإنسان في أدب وادي الرافدين، بغداد، ١٩٨٠.
(١٣) ب. لا، ٣٤، د. احمد سوسة، تاريخ حضارة وادي الرافدين، الجزء الأول، ١٩٨٣.

(١٤) ب. س. پ. لا، ٣٦٩.
(١٥) ب. س. پ. لا، ٦٨-٦٩، العراق في التاريخ.
(١٦) ب. س. پ. لا، ٢٣٠، جۆرج رۆ.
(١٧) ب. لا، ١٠، د. پاکیزە ڕەفیق حیلمی، گۆڤاری کاروان، ژمارە، ٦٢.
(١٨) ب. لا، ٦، احسان نوری، تاریخ ریشە نژادی کرد، ناشر: کتاب فروشی بزرک سیدیان، چاپخانە پیروز، ١٣٦١ هەتاوی.



# بەشی شەشەم

## سۆمەرییەکان و کورتەیەکی مێژووەکەیان

سۆمەرییەکان خۆیان بەخۆیان نەوتووە سۆمەری و وڵاتەکەشیان ناوی سۆمەر نەبووە. وشەی سۆمەر هەر نەبووە و نەبینراوە لە هیچ نووسراوێکدا!! بەڵام ئاشووری ناسەکان ئەم ئەفسانەیەیان هەڵ بەست بۆ مەبەستی تایبەتی خۆیان...، ئاخنییانە مێشکی خوێندەوارەکانیان و وایان تێگەیاندن کە (سۆمەر)ی ناوی ئەو نەتەوە بلیمەتەیە کە یەکەم لاپەڕەی مێژووی هەڵدایەوە لە هەزارەی سێیەمدا.

سۆمەرییەکان خۆیان بەوڵاتەکەیان دەوت (ئوریکی- URIKI) کە ناوی شارەکەیان (ئۆرۆک) کە یەکێک بووە لە شارە پیرۆزەکانیان لەو ناوەوە وەرگیراوە[١].

لێرەدا نابێت زاراوەی (کاردۆنیاش) لەبیر بکەین کە کاشییەکان لە وڵاتی بابل و دەشتی لیتەییان ناوە، کاردۆنیاش واتە (وڵاتی خوداوەند دۆنیاش) کە خوداوەندی نەتەوەیی کاشییەکانە[٢]. سۆمەرییەکان نێوی خۆیان بە سێ هێمای مێخی نووسیوە کە بریتین لە (KI. EN. GI).

هەر لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمەوە و لەپاش دۆزینەوەی نێوی سۆمەر و سۆمەرییەکان لەسەر تەختە گڵەکانی کتێبخانە مێژووییە مەزنەکەی ئاشوور بانیپاڵدا لە شاری ئاشووری کۆن، زانا ئارکیۆلۆژییەکان و مێژوونووسەکان کەوتنە خۆیان بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر سۆمەرییەکان، لەو کاتەوە تاوەکو ئێستا بەسەدان کتێب و هەزاران وتاریان دەربارەی مێژووی ئەم سۆمەرییانە لە چاپ داوە، کە تێیدا دەربارەی مێژوو و ژیانی رۆژانە و کاروباری کۆمەڵایەتی و هونەری و هەستی ئایینییان و سیاسەتیان و لیستەی پادشاکانیان و یاسا و سیستەم و جۆری حکوومەتەکانیان و چی و چیی تریان تێدا روون کردۆتەوە. بەڵام لە هەموویان باشتر کتێبە بەنێوبانگەکەی زانای ئارکیۆلۆژی (گرامەر)ە کە بەشێوەیەکی زۆر

ئەكادیمیانە دەربارەی سۆمەرییەكان دواوە و بەپێی توانای خۆی و ئەو سەردەمەی زۆربەی كون و كەلەبەرەكانی مێژووی سۆمەرییەكانی پشكنیوە.

لەبەرئەوەی مێژوو سەروەری لێكۆڵینەوە مرۆڤایەتییەكانە، هەر باسێک لە باسەكانی ئاو زۆر دەكێشێت، چ جای مێژووی سۆمەرییەكان كە باوەڕناكەم كە بەكتێبێک و دووان تەواو ببێت، چونكە هەڵكۆڵین و پشكنینی ئاركیۆلۆژی لە ناوچەی سۆمەرییەكاندا هەر بەردەوامە و هەر جارەی شتێكی نوێتر دەدۆزرێتەوە، بۆ نموونە دۆزینەوەی هەر گۆڕێكی پادشایەكی سۆمەری ئەگەر بێت و بەتێروتەسەلی لە سەری بنووسرێت و مافی خۆیی پێ بدرێت پێویستیی بەكتێبێكی تەواو هەیە. لەبەرئەوە من لێرەدا وەک پێویستییەكی باسەكە و بۆ ئەوەی سەرەتایەک لە مێژووی سۆمەرییەكان بزانین تەنها كورتەیەكی لێ باس دەكەم، چونكە بەڕاستی لێدوان لە مێژووی سۆمەرییەكان بەتەواوی پێویستی بەڕەشكردنەوەی سەدان و بگرە هەزاران بەرپەڕ دەبێت.

## فوراتییە سەرەتایینەكان و سۆمەرییە هەرە كۆنەكان

هەروەک باس كرا فوراتییە سەرەتاییەكان لە دەوروبەری هەزارەی پێنجی پ.ز دا لە ناوچەكانی حەوزی فورات و دەشتی لیتەییدا ژیاون، ئەو فوراتییە سەرەتاییانە هەر ئەو نەتەوانەن كە لە ناوچەكانی چیاكانی كوردستاندا و لەوەوبەر لە ئەشكەوتەكانی شانەدەر و گۆڕاین و تەپەسیاڵک و گوندەكانی وەک جۆگەمامی و چەرموودا ژیاون.

هێندێک لە مێژوونووسان دەڵێن كە پەیوەندییەكی پتەو لەنێوان ئەم فوراتییە سەرەتاییانە و سۆمەرییە هەرە كۆنەكاندا هەیە، بەڵكو هەندێكیان گەیشتوونەتە رایەكی وا كە بڵێن ئەم فوراتییە سەرەتاییانە رەسەن و باب و باپیری سۆمەرییە كۆنەكانن، چونكە ئەم سۆمەرییە كۆنانەش لە دەوروبەری هەمان مێژوودا لە ناوچەكانی ئەم فوراتییانەدا نیشتەجێ بوون یاخود بەماوەیەک لە دوای ئەوانەوە، ئەم رایە چەندین بەڵگە دەیسەلمێنێت لەوانە بوونی ئەو هەموو زاراوانەی زمانی فوراتییە





سەرەتاییانە لەنێو زمانی سۆمەریدا و هەروەها ئەو پەیوەندییە بەهێزەی كە لەنێوان ئایینی هەردوولادا هەیە، هەرچەندە ئایینی سۆمەرییەكان پێشكەوتووتر بووە، ئەمیش وەک حەتمییەتێكی مێژوویی لەبەرئەوەی لەپاش ئەوانەوە بوون، پێویست بووە پەرە بەو دابونەریتە ئایینییانە بدەن. هەروەها ئەو كەرەستە ماددی و ئاركیۆلۆژییانەی كە لە ناوچەی سۆمەرییە هەرە كۆنەكاندا دۆزراونەتەوە دەتوانین بڵێین وەک هەمان كەرەستەی فوراتییە سەرەتاییەكانە بەڵام بەشێوەیەكی پێشكەوتووتر لەبەرئەوەی بەماوەیەكی مێژوویی لە دوای فوراتییەكاندا نیشتەجێ بوون.

## نووسینی سۆمەرییەكان

زمان وەک هۆیەک بۆ لە یەكگەیشتنی مرۆڤ لە یەكتری گرنگترین دیاردەیە لە ژیانی مرۆڤدا، هەر بۆیەشە بەباڵاترین كەرەستەی شارستانێتی دادەنرێت، زمانی سۆمەرییەكان كۆنترین زمانە لە دەشتی لیتەییدا و بگرە لە تەواوی جیهانیشدا كە بەهێڵی مێخی هاتبێتە نووسین، نووسین بازدانێكی زۆر مەزن بوو بۆ بۆ ئەوەی شارستانێتی لە هەنگامێكەوە بچێت بۆ هەنگامێكی تر و مرۆڤ ماڵئاوایی یەكجارەكی لە سەدەكانی پێش مێژوو بكات و هەر بەهۆی نووسینەوە بوو كە سۆمەرییەكان مێژووی خۆیانیان تۆماركرد و بەهۆی تەختە گڵینەكانەوە بەدەست مرۆڤی ئەم سەردەمە گەیشت، لەبەرئەوە مێژووی سۆمەرییەكان لەپاش لێكۆڵینەوەی كەلاوە كۆن و پارچە فەخفوری و گۆزە و دیزەكانیان، لەو تەختە گڵینانەوە دەست پێ دەكات.

ئاشكرایە كە سۆمەرییەكان یەكسەر نەگەیشتوونەتە داهێنانی نووسینی مێخی، بەڵكو وەک هەموو دەستكەوتێكی شارستانیی تر بەچەند هەنگامێک و ماوەیەكی زۆردا تێپەڕیوە.

پرۆفیسۆر پاكیزە رەفیق حیلمی لە لێكۆڵینەوەكەی خۆیدا دەربارەی سەرهەڵدانی نووسین دەڵێت «ئەوەی لە هەمووی گرنگترە لە مێژوودا ئەوەیە كە لە كۆتایی ئەم دەورەدا، لە پەرستگاكەی ئی. ئانا E. ANNA لە

ئۆڕۆک، نووسین بۆ یەکەم جار لە شێوەی وێنەییدا دۆزراوەتەوە. بەڵام من ئەڵێم – واتە د. پاکیزە – (مۆرە)کانی خەڵەف و تەپەگەورە یەکەم پلەی نووسین بوون و خەتی وێنەیی (ئۆڕۆک) دووهەم پلەیە و، دیسانەوە بۆ ساغکردنەوەی مێژوو و دۆزینەوەی یەکەم لاپەڕەی دەبێ بەرەو ژووروو بینەوە و زێتر و قووڵتر هەڵکۆڵین. گومان نییە لەوەدا کە ئەو سڕە هەر دەکەوێتە سەر ئەرز ڕۆژێک! چونکە ئەقڵ نای بڕێ ئینسانی ئەو ناوە (مێزۆپۆتامیا)ی ژووروو، پاش ئەو ڕێگە دوور و درێژەی بڕی لە داهێنانی شارستانیدا، لە ئەنجامدا وەک بڵقی سەرئاو بکوژێتەوە لە پڕ و ئەسەری نەمێنێ و لە پڕ لە میزۆپۆتامیای خوارووددا ئەو شارستانییە وەک قارچک هەڵتۆقێ! بەڵام دیارە یەشتا زانایانی ئارکیۆلۆژی و زمان پلەیەکی تری ڕەنجیان لەبەرە بۆ ئەوەی ئەم تاکە سڕە لەبن ئەرز دەرهێنن»[٣].



13

لیستی پادشا سۆمەرییەکان لەسەر تەختە گڵێک





هەرچی چۆنێک بێت سۆمەرییەکان لە پێشدا لەسەر ئەو تەختە گڵینانە بۆ تۆمارکردنی مەبەستەکانی خۆیان وێنەیان کێشاوە کە هەر وێنەیەک واتای زاراوەیەک یان ئاژەڵێک یا هەر شتێکی تری بەدەستەوە داوە کە ئەمیش بەنووسینی (هیرۆگلیفی) بەنێوبانگە، سۆمەرییەکان یاخود هەر گەلێکی تری ناوچەی دەشتی لیتەیی کە لەوانەیە و بەڵکو زۆریش ڕێی تێ دەچێت کە فوراتییە سەرەتاییەکان بووبن کە لە دەوروبەری هەزارەی چوارەمی پ.ز دا نووسینی وێنەییان داهێناوە. پاشان ئەم جۆرە نووسینە پەرەی سەندووە تا لە دەوروبەری 3500 پ. ز نووسینی مێخی هاتووەتە کایەوە، کە ئەم جۆرە نووسینە لە چەرخی وەرکادا لە (چینی چوارەمی شارستانیی ئەم شارە)دا دۆزراوەتەوە. هەروەها لە چەندین ناوچەی تری وەک (جمدة نصر) و ئور و شروپاک و شوێنانی تریشدا هەمان نووسین دۆزراوەتەوە[٤].

## پادشا و فەرمانڕەوا سۆمەرییەکان

خشتەی پادشا سۆمەرییەکان بۆمان دەگێڕێتەوە کە پادشایەتی بۆ یەکەم جار لە ئاسمانەوە بۆ شاری ئاریدۆ هاتووەتە خوارەوە[٥].

سۆمەرییەکان پادشاکانی خۆیانیان کردووە بەدوو بەشەوە، بەشی یەکەمیان ئەوانەن کە پێش لافاوە بەنێوبانگەکە فەرمانڕەوایی سۆمەرییان کردووە، لە پێش لافاوەکەدا هەشت پادشا لە پێنج شاری سۆمەریدا فەرمانڕەوا بوون، هەریەک لەم پادشایانە چەندساڵێکی خەیاڵی فەرمانڕەواییان کردووە کە بەهەر هەشتیان (241200) ساڵی فەرمانڕەواییە، ئەو شارانەش بریتین لە ئاریدۆ کە هەردوو پادشای (ئالوم) و (کار) (64800) ساڵ فەرمانڕەواییان تێدا کردووە و شاری (پادت پیرا – دورکورکوڕی) کە پادشایان (ئەئمینلو ئەنناو و ئەتسمنەکالناو دەموزی) بۆ ماوەی (108000) ساڵ فەرمارەواییان تێدا کردووە. پاشان لە راک کە پادشا (ئەنسیز) (28000) ساڵ فەرمانڕەوایی تێدا کردووە. هەروەها شاری سپار، پادشا (ئەنمیندۆڕاننا) (21000) ساڵ

و لە كۆتاییدا پادشا (ئۆبار تۆتۆ) لە شاری شروپاكدا (28600) ساڵ فەرمانڕەوایی تێدا كردووە[٦].

لە راستیدا ئەو ژمارانەی كە بەرچاومان كەوتن زۆر سەرسوڕهێنەر و خەیاڵین و لە باوەڕی كەسدا نییە كە مرۆڤی ئەو سەردەمە هێندە ژیانی بەسەر بردبێت، هەرچی چۆنێک بێت لەوانەیە ساڵ لەلای سۆمەرییەكان و لە پێش لافاوەكەدا ئەو پێوانەیەی نەبووبێت كە ئێستا هەیە و ئەگەر ساڵ لەلای ئەوان مانگیش بووبێت هێشتا ئەو ژمارانە هەر زۆر زۆرن و خەیاڵین.

چیرۆكی لافاوەكە شوێنێكی تایبەتی لەناو ئەدەبی سۆمەری و بگرە ئەكەدی و بابلی و ئاشوورییەكانیشدا هەیە، ئەو لافاوە هەر ئەوەیە كە لە كتێبە ئایینییەكانی وەک تەورات و قورئاندا باس كراوە، بەڵام بەدەستەواژە و نێوی جیاجیا. بۆ نموونە لە ئەدەبی سۆمەریدا لەباتی (نوح) خاوەن كەشتی و رزگاركەری مرۆڤ بووبێت هەروەكو لە قورئاندا هەیە لەوێدا نوح نێوی (ئۆتۆناپشتم) بووە.

لەپاش نیشتنەوەی لافاوەكە پادشایەتی بۆ جاری دووەم لە شاری كیشی نزیک بابلەوە هاتووەتە خوارەوە. شاری كیش رۆڵێكی سیاسیی دیاری لە چەرخی بەرەبەیانی بنەماڵەكاندا هەبووە، چونكە پادشاكانی ئەم بنەماڵەیە توانییان یەكێتیی ناوخۆیی وڵاتەكەیان بەدی بهێنن لە ساڵی (2800 پ.ز.دا[٧].

هەروەها لە بنەماڵە بەنێوبانگەكانی سۆمەر، بنەماڵەی وەركای یەكەمە كە بەپێنجەمین پادشایەوە نێوی دەركرد لە دەوروبەری (٢٧٠٠) پ.ز، ئەو پادشایەش گلگامشە كە داستانی گلگامشی سۆمەریی بەنێوبانگ دەگەڕێنرێتەوە سەر ئەو.

بەو شێوەیە بنەماڵەی سۆمەرییەكان بەردەوام بوو لە فەرمانڕەوایی وڵاتی سۆمەردا تاوەكو دوا پادشایان (لۆگال زاگیزی) كە لەسەر دەستی سەرگۆنی ئەكەدیدا لە دەوروبەری (٢٤٠٠ –٢٣٧١) پ.ز كۆتایی بەفەرمانڕەوایی هێنرا و بنەماڵەی سۆمەرییەكان رووخا. ئیتر ناوچەی سۆمەر كەوتە ژێر





دەستی ئەكەدییەكانەوە هەتا ئەو كاتەی كە گۆتییەكان لە چیاكانی باشووری كوردستانەوە هێرشیان هێنایە سەر ئەكەدییەكان و لە دەوروبەری (٢٢٠٠) پ.ز ناوچەكەیان گرت و بۆ ماوەی یەک سەدە زێتر واتە تا (٢١١٦) پ.ز فەرمانڕەواییان تێداكرد[٨]. یان بەشێوەیەكی تر ماوەی دەسەڵاتی گۆتییەكان لە وڵاتی سۆمەردا بەتەواوەتی ١٢٥ ساڵ و ٤٠ رۆژ بوو[٩].

لە دەوروبەری (٢١٢٠) پ.ز لە شاری وەركادا سەرۆكێكی سۆمەری بەنێوی (ئۆتۆ هیگاڵ)ەوە دەركەوت كە توانی ناوچەی سۆمەر رزگار بكات و گۆتییەكانی تێدا بكاتە دەرەوە. پاش كۆتایی هاتنی فەرمانڕەوایی ئۆتۆ هیگاڵ بنەماڵەی ئوری سێیەم دەست پێ دەكات (2113-2006) پ.ز كە بەدوا بنەماڵەی سۆمەری لە مێژوودا دادەنرێت، پادشا (ئۆر نەموو– ٢١١٣– ٢٠٩٦) پ.ز بەدامەزرێنەر و بەبەنێوبانگترین پادشای ئەم بنەماڵەیە دادەنرێت[١٠]. ئەوی شایانی باس بێت لە سەردەمی ئەم پادشایەدا بۆ یەكەم جار لە مێژووی مرۆڤایەتیدا كۆمەڵگەیەكی رێكخراو و چەكدار بەچەند ماددەیەكی یاسایی هەست پێ دەكەین، ئەم پادشایە بەنێوی خوداوەندی شارەكەیەوە چەند یاسایەكی دەركردووە كە زۆربەیان بەسزای سەختەوە پەیوەست بووە بۆ ئەوكەسانەی كە پێشێل و سەرپێچی ماددەكانی بكەن، كەواتە كۆنترین یاسا لە سەردەمی حامورابیدا نەبووە وەک زۆركەس بەهەڵە وای دەزانن! بەڵكو تا ئێستا كۆنترین یاسا كە بەدەست ئێمە گەیشتبێت یاسای ئورنەمووە.

لە ساڵی (٢٠٠٦) پ.ز دا بەیەكجاری لە مێژوودا و لەسەردەستی ئەموری و ئیلامییەكاندا كۆتایی بەفەرمانڕەوایی سۆمەرییەكان هێنرا، هۆی كەوتنی بنەماڵەی سۆمەرییەكان ئەوەبوو كە دوا پادشایان (ئابی سن) لاوێكی كەم تەمەن بوو و بێ تاقیكردنەوەی رامیاری بوو هەروەها گرانیی ئەو باجانەی كە خرابوونە سەر ناوچەكان و خراپیی باری ئابووریی وڵات وای كرد كە زۆربەی هەرێمەكان لە فەرمانڕەوایی ئەم پادشایە بكشێنەوە. بەم شێوەیە ئیلامییەكان توانییان دەست بەسەر وڵاتی سۆمەردا بگرن و بۆ

هەتاهەتایە کۆتایی بەفەرمانڕەوایی سۆمەر بهێن.

باسکردنی هەموو پادشا و بنەماڵە فەرمانڕەوا و شارەکانی سۆمەر باسێکی زۆر درێژخایەنە، من لێرەدا بەکورتی باسی گرنگترین پادشا و بنەماڵەکانیانم کرد، بێگومان زۆر لە پادشایان و بنەماڵەی تر فەرمانڕەوایی سۆمەرییان کردووە، بەڵام باسکردنی هەموویانم بەپێویست نەزانی بۆیە لێرە بەدواوە دەچمە سەر باسی ژیانی کۆمەڵایەتیی سۆمەرییەکان.

## چمکێک لە ژیانی کۆمەڵایەتیی سۆمەرییەکان

پێکهاتنی چینە کۆمەڵایەتییەکانی سۆمەری بریتی بووە لە سێ بەشی سەرەکی، بەشی یەکەمیان چینی کۆیلەکان بووە، ئەم کۆیلانە وەک هەر شمەکێکی تر لە بازاڕی سۆمەرییەکاندا فرۆشراون و ئاڵ و وێریان پێ کراوە، کۆیلە بەنزمترین چینەکانی کۆمەڵ دانراون و هیچ مافێکی رامیارییان لە وڵاتدا نەبووە، ئەم کۆیلانە لە ئەنجامی شەڕ و شۆڕەکانی وڵاتی سۆمەر لەگەڵ دەوروبەرەکانیدا هەمیشە ژمارەیان لە زۆربووندا بووە. چونکە دیلەکانی شەڕ کراونەتە کۆیلە و مافی گەڕانەوەیان نەبووە بۆ وڵاتی خۆیان، هەر کۆیلەیەک لەمانە بەهۆی ملوانکەیەکەوە کە تەختەی گڵێکی بچووکی پێوەبووە و نێوی سەرداری ئەو کۆیلەیەی لەسەر نووسراوە، ناسراونەتەوە. چینی کۆیلەکان زۆربەی کات ژن و ژنخوازییان هەر لە نێو یەکدا بووە، منداڵەکانیشیان بەو پێیە بوونەتە کۆیلە و شمەکی ئەو سەردارەی کە خاوەنی باوک و دایکی ئەم منداڵانە بوون. هێندێک نووسراوی سەر تەختە گڵەکانی سۆمەری وای دەردەخات کە شووکردن و ژنهێنانیش لەنێوان چینی کۆیلە و چینەکانی تردا هەبووە بەڵام منداڵەکانیان هەر بەکۆیلەیەتی ماونەتەوە تا ئەو کاتەی کە رزگار بوونیان لە کۆیلەیەتی لەلایەن باوک یاخود دایکە ئازادەکەیانەوە ئاشکرا کراوە. باری گرانی کۆمەڵ و کارکردنی سەخت لەسەر شانی ئەم کۆیلانە بووە، بەرامبەر بەپارووە نانێکی مەمرە و مەژی کە گوزەرانیان پێ کردووە





بەدرێژایی مێژووی سۆمەرییەکان هیچ شتێکی وامان بەرچاو ناکەوێت کە ئەم کۆیلانە بۆ چارەکردنی باری کۆمەڵایەتی و گوزەرانیان بزووتنەوەیەک یاخود شۆڕشێکی وایان دژی سەردارەکانیان و چینە ئازادەکان کردبێت، هەروەکو چۆن لە شۆڕشی (سپارتاکۆس)دا کۆیلەکان شۆڕشێکی مەزنیان دەربارەی چینە ئازادەکان بەرپا کرد.

لە یاسا سۆمەرییەکاندا و بەتایبەتی لە یاسای ئۆر نەموودا، حاشاکردنی کۆیلەیەک لە سەردارەکەی چەندین سزای سەختی بۆ دانراوە، ئەوەی شایانی باس بێت هەر لەو یاسایەی ئۆر نەموودا هەندێک لە ماددەکانی پەیوەندی نێوان چینی کۆیلە و چینەکانی تری رێکخستووە[١١].

چینی دووەمی سۆمەرییەکان بریتی بوون لە چینە سەربەستەکان کە ئەمانە لە دەوڵەمەند و خێزانە ئەریستۆکراتییەکانی وڵاتی سۆمەر بوون، هەر ئەمانەشن کە سەرداری کۆیلەکان بوون. ئەم چینە خاوەن زەوی و هۆیەکانی بەرهەمهێنان و زەوییە کشتوکاڵییەکان بوون، هەرچی رەز و باخی وڵاتی سۆمەر هەبووە موڵکی ئەم چینە سەربەستە بووە، لەنێو ئەم چینەدا سێ توێژی کۆمەڵایەتیی زۆر گرنگ هەبوون کە بریتی بوون لە:

یەکەم: زێوانی پەرستگاکان.

دووەم: ئەفسەرە سەربازییەکانی نێو لەشکری سۆمەرییەکان.

سێیەم: خێزانی پادشا (فەرمانڕەوای رامیاریی وڵاتی سۆمەرییەکان).

چینی سێیەمی سۆمەرییەکان بریتی بوون لە چینی نێوەڕاست، ئەمانە هەندێک لە هۆیە بەرهەمهێنە بچووکەکانیان بەدەستەوە بووە، وەک چنین و رستن و دروستکردنی گۆزە و دیزە و پیشەسازییە دەستکردەکانی تر، هەروەها جووتیارەکانیش زۆربەیان سەر بەم چینە بوون، کەواتە ئەم چینە بەتەواوەتی نێوەڕاستی چینی کۆیلە و چینی سەربەست بووە چونکە نە وەک کۆیلەکان ژیانیان ئەستەم و بن دەست بووە و نەوەکو چینی سەربەستیش خاوەن دەستەڵات و ئیمتیاز بوون.

پادشا لە وڵاتی سۆمەرییەکاندا هەر قسەیەکی کردبێت وەک یاسا وا

بووە، هەر پادشـــایەک چەند راوێژکـــارێکی خـــۆیی هەبووە بەتایبـــەتی راوێژکاری ئایینی کە لە هەموویان گرنگتر بووە و رای خوداوەندی بەپادشا گـەیاندووە و بۆی لێکداوەتەوە، دەربارەی هەر هەنگاوێک کـە پادشـای سۆمەر لە هەر کارێکدا نابێتی.

لە ولاٌتی سـۆمـەرییـەکـاندا وەک یارمـەتیـدەرێکی پادشا بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری رامیاری و سەربازیی ولاٌت دوو ئەنجوومەن هەبوون کە ئەوانیش (ئەنجوومەنی پیـران) و (ئەنجوومەنی جەنگاوەران) بوون کە ئەمانە لەنێو چینە سـەربەسـتـەکـاندا هەلٌبـژێردراون، ئەم دوو ئەنجـوومـەنە کـەم تا زۆر بەشـداریی رامـیـاریی سـۆمـەرییـەکـانیـان کـردووە و جـار نەجـارێکیش دووبەرەکـیـــان کـەوتۆتە نێـوانەوە. رۆلٌی ئەم دوو ئەنجـوومـەنە لە بەشـداریکردنی رامـیـاریی سـۆمـەرییـەکـاندا بەتەواوەتی لە داسـتـانی گلٌگامشی بەنێوبانگدا هەست پێ دەکەین(١٢).

کۆمەلٌگەی سۆمەری زێتر کۆمەلٌگەیەکی کشتوکالٌی بووە، گەنم و برنج زۆرترینی ئەو دانەوێلاٌنەن کـە سـۆمـەرییـەکـان پێـوەی خـەریک بوون، پیشەسازییان بەزۆری بریتی بووە لە کەرەستە جەنگییەکانی وەک تیر و کەوان و رم و گـالیسکە و چەندان کـەرەستەی تر هەروەها رستن و چنین و گۆزەکاری و کەلوپەلی تر، لە گوندەکاندا جگە لە کشتوکالٌ، مەڕوماڵاٌت پەروەردەکردن و شوانێتی پیشەیەکی سەرەکی و زۆر گرنگ بووە.

ولاٌتی سۆمەر وەک ئاشکرایە ولاٌتێکی بێ کانزایە، لەبەرئەوەی کانزاکان زۆربەیان لە ناوچە شـاخـاوییـەکـاندا هەن و دەردەهێنرێت، بێگومـان دروسـتکردنی ئامـێـرە جەنگییـەکـان پێـویسـتی بەجۆرەها کـانزا هەیە و بەرێژەیەکی زۆریش، هەر لەبەر ئەم مەبەستەش بوو سۆمەرییەکان کەوتنە خۆشکردنی پەیوەندیی دیپلۆماسی لەگەلٌ دراوسێکانیاندا. بەدەستخستنی کانزا لەلایەن سۆمەرییەکانەوە ئەوەندە گرنگیی هەبووە کە زۆرجار وای لێ کردوون کە لەگەلٌ نەتەوە چیاییەکانی زاگرۆس و کوردستاندا بەشەڕ بێن، تاوەکـو خـۆیان ببنە خـاوەنی ئەو چیـایانە و کـانزایان بەئاسـانی وەچنگ بکەوێت بۆ دابینکردنی کەرەستە جەنگییەکانیان.









14 مۆرێکی لوولەیی کە وێنەی چەند خوداوەندێکی لەسەرە

هونەری سـۆمـەرییـەکـان هونەرێکی زۆر بەرز و پڕ لە تەکنیک و داهێنانی سـەیرە، بوونی ئەو هەمـوو کارە هونەرییە مەزنانەی کە لە مۆزەخانەکانی جیهاندا هەن گەواهی بۆ پێشکەوتوویی هونەری سـۆمـەرییـەکـان دەدەن، سـۆمـەرییـەکـان لە دروسـتکردنی فـەخـفـووری و گـۆزە و دیزە و پەیکەر و خانووبەرەدا زۆر پێشکەوتوو بوون.

هونەری بیناسـازی لە ولاٌتی سـۆمـەردا گـەیشـتـۆتە پلەیەکی وا کـە ئەندازیارانی ئێسـتـای سـەرسام کـردووە، دروسـتکردنی ئەو هەمـوو کـۆشک و تەلار و پەرسـتگا و زەکـوورانە بەگـەورەترین کـاری بیناسـازیی کـۆن دەژمـێـردرێت، کـە هەمـوویان بەپێی نەخـشـــەی رێکوپێک و ئەندازەییـــانە دروست کراون، بەلاٌم لە هەموویان گرنگتر دروسـتکردنی پەرسـتگـای زەکـووڕەیە کـە بەرزایی هەندێکیـان دەگـاتە (٨٠ پێ) کـە ئەمـــەش زۆرتر پێـــشـکەوتوویی هونەری بیناسازیی سۆمەرییەکان دەردەخات هەروەکو لە دواییدا باس دەکرێت.

ئەوەی شایانی باسە ئایین رۆلٌێکی بالاٌی بینیوە لە پێـشـخـسـتنی هونەر و پەیکەرتاشین و دروسـتکردنی پەرسـتگا و زەکـووڕەکـاندا بەو شـێـوە نـایابە. هەر ئایینیـشـە کـە رۆلٌێکی کـاریگەر و ترسناکی لە مێژووی سۆمەرییەکاندا هەبووە و لە هەمـوو کون و قوژبنێکی ولاٌتی سۆمـەردا پەیکەری خوداوەندەکانی تێدا بووە. کۆمـەلٌەی خوداوەندە سۆمەرییـەکـان دەتوانین لەسـەر مـۆرە لوولەییـیـەکـان ببـینین کـە لە مـاوەی

ئۆرۆک یاخود ماوەی چاخی نیمچە مێژووییدا دۆزراونەتەوە. خوداوەندە سۆمەرییەکان هەروەکو خوداوەندی گریکەکان لە لەشولاردا هەروەکو مرۆڤ وابووە و خووڕەوشتی مرۆڤی هەبووە، نووستووە و خواردوێتی و خواردوێتییەوە، هەروەها خۆشەویستیی کردووە و رکیشی هەڵساوە، تەنانەت هەندێ جار مردووشە، بەڵام جیاوازیی نێوان ئەم خوداوەندانە و مرۆڤ ئەوە بووە کە خوداوەندەکان خاوەن هێزێکی بێ سنوور و مەزن بوون.

چیرۆکی دروستبوونی گەردوون کە کۆنترین و بەنێوبانگترینی ئەفسانەی سۆمەرییەکانە، دەتوانین نێوی زۆربەی خوداوەندە سۆمەرییەکانی لێ هەڵبهێنجین، جگە لە ئەفسانەکانی تر کە هەر یەکەیان کەم و زۆر نێوی ئەو خوداوەندانەیان هێناوە.

## گرینگترین خوداوەندەکانی سۆمەر ئەمانەن:

١- خوداوەند ئانۆ: کە خوداوەندی ئاسمان بووە و بەگرینگترین و گەورەترین خوداوەندە سۆمەرییەکان دادەنرێت، چونکە خوداوەندی هەموو خوداوەندەکان بووە. ئەو خوداوەندە وەکو لە زۆربەی تێکستە مێخییەکاندا دەردەکەوێت باوکی زۆربەی خوداوەندەکانە، وەک خوداوەندی با (ئەنلیل) و خوداوەندی ئاووهەوا (ئاشکوڕ) و خوداوەندی ئەڤین و ژیان (ئەنانا). هەروەها باوکی خوداوەند (پاپا)یشە کە خوداوەندی شاری لەگشە و ژنی خوداوەند (نەنگرسۆ)یە، جگە لە خوداوەند (کاتۆم دۆک) کە بەدایکی هەموو زاڕۆڵان و شاری لەگش دادەنرێت، هەروەها خوداوەند (نەسابا) خوداوەندی دانەوێڵە و دیسانەوە باوکی زۆربەی خێو و درنجەکانە، هەر ئەم ئانۆیەشە کە خوداوەندی نەخۆشی و مردنی بۆ مرۆڤ دروست کردووە، جگە لە چەندین خوداوەندی تر[١٣].

٢- خوداوەند ئەنلیل: خوداوەندی بایە کە بەپلەی دووەم دێت لە دوای ئانۆوە.

٣- خوداوەند ئەنکی: خوداوەندی زەوی و ئاوەکانی ژێر زەوی و بەپلەی







15

هێمای خوداوەند ئانۆ

16

هێمای خوداوەند ئەنلیل

سێیەم دێت.

٤- خوداوەند ئۆتۆ: کە خوداوەندی خۆرە و بەپێی بیروباوەڕی سۆمەرییەکان خوداوەندی خۆر لە شەودا نوقمی دەریاکان دەبێت و بەیانییانیش لە نێوان چیاکانەوە هەڵدێت[١٤].

٥- خوداوەند نەنگرسۆ: خوداوەندی شاری گەرسۆی سۆمەری.

٦- خوداوەند مەردۆخ: کە خوداوەندی کۆنی سۆمەرییەکان بووە و پاشان لە سەردەمی بابلییەکاندا بۆتە خوداوەندی شاری بابل.

ئەوانەی سەرەوە نێوی هەندێک لە گرینگترین خوداوەندە سۆمەرییەکان



17 هێمای خوداوەند ئەنکی

18 هێمای خوداوەند ئۆتۆ

بوون کە هەریەکەیان بەپێی پلەوپایەی مەزنێتییان لەلایەن سۆمەرییەکانەوە پەرستراون و هەزاران پەیکەر و پەرستگایان بۆ دروست کراوە، سۆمەرییەکان لەو بڕوایەدا بوون هەر شتێک خوداوەندێکی هەیە و پاشانیش نابێت ئەوە لە بیربکەین کە لەنێو ئەو هەموو خوداوەندانەی سۆمەرییەکاندا خوداوەندی دایک کە هەر لە سەردەمی گوندەکانی زاوی چەمی و چەرموودا شانەدەرییە کوردستانییەکانی چاخی بەردینی نوێ پەرستوویانە، جێگایەکی تایبەتیی هەبووە و هەزاران پەیکەری بۆ دروست کراوە، ئەم خوداوەندە بەزمانی سۆمەرییەکان پێی گوتراوە (نەنخورساک).





زانست بەگشتی لە سەردەمی سۆمەرییەکاندا بەهایەکی تایبەتی هەبووە، هەندێک لە تەختە گڵە سۆمەرییەکان ئەوەمان بۆ دەردەخەن کە سۆمەرییەکان ئاگاداریی جوولەی ئەستێرەکان و وەرزەکان و مانگ گیران و خۆرگیران و دوازدە بورگەکە بوون. هەروەها لە زانستی ماتماتیکیشدا هەوڵی شیکارکردنی چەندین دۆزیان داوە و شارەزاییان لە کۆکردنەوە و لێکدان و دابەشکردندا بەتەواوەتی هەبووە، ئەوەی جێی سەرسوڕمانە یەکێک لەو تەختە گڵانەی کە لە کتێبخانەکەی ئاشووربانیپاڵدا دۆزراوەتەوە و کە دەگەڕێتەوە بۆ سۆمەرییەکان، باسی تیۆرە ماتماتیکییە بەنێوبانگەکەی (فیساگۆرس) دەکات، کە گریکییەکان بەهەڵە داویانەتە پاڵ فیساگۆرس یاخود فیساگۆرس لەوانەوە وەری گرتبێت، دۆزینەوەی بیردۆزێکی وەک فیساگۆرس لەلایەن سۆمەرییەکانەوە ئەوە دەگەیەنێت کە لە زانستی ماتماتیکدا زۆر پێشکەوتوون.

هەروەها لە پزیشکایەتی و چارەکردنی نەخۆش و دەرمان و گیاسازیشدا سۆمەرییەکان زانینی باشیان هەبووە هەروەکو لەو تەختە گڵانەدا دەردەکەوێت کە بۆ ئێمەیان بەجێ هێشتووە، جگە لە ماددەکانی یاسای ئۆڕنەموو کە هێندێکیان پەیوەندیی نێوان پزیشک و نەخۆش ڕێک دەخات و کرێی پزیشک لە هەندێک نەخۆشیدا دیاری دەکات.

## پەراوێزەکانی بەشی شەشەم:

(١) ب. لا، ١٨ د. پاکیزە رەفیق حیلمی، گۆڤاری کاروان، ژمارە ٦٢.

(٢) ب. لا، ١٣٨، د. سامي سعيد الاحمد، العراق القديم، الجزء الاول، بغداد، ١٩٧٨.

(٣) ب. س. پ. لا، ١٧، د. پاکیزە، گۆڤاری کاروان.

(٤) ب. س. پ. لا، ٦٢، تەها باقر.

(٥) ب. س. پ. لا، ٦٩، العراق في التاريخ.

(٦) ب. س. پ. لا، ٢٣٨-٢٤٣، د. سامي سعيد الاحمد.

(٧) ب. س. پ. لا، ٧٠، العراق في التاريخ.

(٨) ب. س. پ. لا، ١٢٤، جین پۆترۆ.

(٩) ب. س. پ. لا، ١٣٤، احسان نوري.

(١٠) ب. س. پ. لا، ٨١، العراق في التاريخ.

(١١) ب. د. فوزي رشيد، الشرائع العراقية القديمة، بغداد، ١٩٧٩.

(١٢) ب. د. طه باقر، ملحمة گلگامش، بغداد، ١٩٨٠.

(١٣) ب. س. پ. لا، ١٥١، حضارة العراق، الجزء الأول.

(١٤) ب. س. پ. لا، ١٩٥.



# بەشی حەفتەم

## یەکەمین نیشتمانی سۆمەرییەکان

ئەو بگرە و بەردەیەی کە لەسەر نەژادی سۆمەرییەکان و یەکەمین نیشتمانی دایکزادەیان هەیە، وای لە زانایانی ئەمڕۆ کردووە کە خۆیان لەم کێشەیە نەدەن و فەرامۆشی بکەن، تا وای لێ هاتووە کە هەندێکیان بڵێن ئەندێشە و تەراویلکەیە و پێویست ناکات مرۆ خۆی پێوە ماندوو بکات.

سۆمەرییەکان نەبولگارین و نە لە ناوچەکانی دۆڵی سند و باشووری بلوخستانەوە هاتوونەتە دەشتی لیتەییەوە. بنەچە و نەژادی ئەم سۆمەرییانە دەگەڕێتەوە بۆ ناوچەکانی چیاکانی زاگرۆس کە ئێستا (کوردستان)ی پێ دەڵێن.

ئاشکرایە کە چیاکانی کوردستان لە دەوروبەری (600.000) ساڵ پێش ئێستێوە مرۆڤی چاخە کۆنەکانی تێدا ژیاوە و لە پاش هەزاران ساڵ و چەندین تاقیکردنەوەی سەخت ئەم مرۆڤانە بوونەتە خاوەن شارستانی، پاشەڕۆکەکانی گوندی چەرموو و سەدان ناوچەی ئارکیۆلۆژیی تر ئەمەمان بۆ دەسەلمێنێت، ئەو سۆمەرییانەی کە ئێمە باسیان لێوە دەکەین نەوەی ئەو کوردستانییە کۆنانەن کە بەدرێژایی زێتر لە نیو ملیۆن ساڵ لە ئەشکەوت و دۆڵەکانی زاگرۆسدا ژیاون.

بردنەوەی نەژاد و پەیوەستەگیی سۆمەرییەکان بۆ ئەو زاگرۆسییە کۆنانە چەندەها بەڵگەی ماددی و ئارکیۆلۆژیی بەهێز و لۆژیکانە پشتگیریی دەکەن، کە لەمەودوا بەدرێژی باسیان لێوە دەکەم.

### ئەو بەڵگانەی کە گەواهی بۆ یەکەمین نیشتمانی سۆمەرییەکان دەدەن

لێکۆڵینەوەی مێژوویی پێش چاخە مێژووییەکان بەهۆی نەبوونی نووسینەوە، بەهۆی کەرەستە شارستانی و بەڵگە ئارکیۆلۆژییەکانەوە دەبێت کە ئەمانەش بریتین لەو پاشەڕۆکانەی کە ئەو نەتەوانە بۆ ئێمەیان بەجێ

هێشتووە. وا لێرەدا گرنگترینی ئەو بەڵگانەی کە یەکەمین نیشتمانی سۆمەرییەکان دەسەلمێنێت کە ئەویش چیاکانی کوردستانە دەخەمە روو...

**بەڵگەی یەکەم: کەرەستە ئارکیۆلۆژییەکان**

کەرەستەی ئارکیۆلۆژی، بەو پاشەرۆکانە دەگوترێت کە مرۆڤی کۆن لە ژیانی رۆژانەی خۆیاندا بەکاریان هێناوە و لە ناوچە و کەلاوە کۆنەکاندا بەهۆی پشکنین و هەڵکۆڵینی ئارکیۆلۆژییەوە دەدۆزرێتەوە، کە بریتین لە ئامێرەکانی راو و کشتوکاڵ و گۆزە و دیزە و دەفر و ئامانی فەخفوری و چەندان کەرەستەی تر، کە مرۆڤی کۆن بەهۆیانەوە کاروباری خۆیانیان پێ بەرێوە بردووە. گرنگترینی ئەو کەرەستانە فەخفورییە، کە بەیەکەم کەرەستە دادەنرێت کە شوێنەوارەوانەکان ژمارەیەکی زۆریان لە شوێنە دێرینەکاندا دۆزیبێتەوە، ئەم فەخفورییانە جگە لەوەی رادەی پێشکەوتن و تەمەنی



19 چەند کەرەستەیەکی گوندی حەسسونە





شارستانی دەردەخات پارچەکانیشی بەهۆی هۆکارە سروشتییەکانەوە لەناو ناچن ئەمە جگە لەوەی کە بوونی ئەم پارچە فەخفورییانە لە هەر ناوچەیەکدا بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە ئەو ناوچەیە، ناوچەیەکی ئارکیۆلۆژییە، واتە دێرینە.

کوردستان لە دەوروبەری پێش نیو ملیۆن ساڵەوە مرۆڤی تێدا ژیاوە، زاراوەی مرۆڤی شانەدەر بۆتە باو بۆ نێونانی ئەو مرۆڤە کۆنانەی کە لە کوردستاندا ژیاون، بەهۆی دۆزینەوەی ئێسکی ئەو مرۆڤە کۆنانەوە بۆ یەکەم جار لە ئەشکەوتی شانەدەردا. ئەم شانەدەرییانە کە هەر لە کۆنەوە خەریکی راوکردن بوون، بەرەبەرە ئامێرەکانی راوکردنیان دروست کردووە و پەرەیان پێ داوە، لە زۆر ناوچە و ئەشکەوتی کوردستاندا ئەم ئامێری راوکردنانە دۆزراوەتەوە.

لەپاش نیشتەجێ بوونی ئەم شانەدەرییانە لە ناوچەکانی وەک پاڵەگەورە و کەریم شار و جۆگەمامی و چەندان ناوچەی تردا لەنێوان (15000 تا 7000) ساڵی پ.ز وە، وردە وردە و بۆ ئاسانکردن و بەرێوەبردنی کاروباری رۆژانەی خۆیان چەندان کەرەستەی وەک گۆزە و دیزە و فەخفوری و ئامێری



20 چەند گڵێنەیەکی گردی حەسسونە

راو و کشتوکاڵ و شتی تریان دروست کردووە و پەرەیان پێ داوە. لەپاش کۆچکردن و نیشتەجێ بوونی ئەم شانەدەرییانە بۆ ناوچەی (حەسوونە) لە دەوروبەری هەزارەی پێنجەمی پ.ز دا پەرەیان بەم کەرەستانە داوە و بەرەو پێشیان خستووە، ئەگەر بێتو بەراوردێک لەنێوان ئەو کەرەستانەی هەزارەی پازدەیەم تا هەفتەمی پ.ز و کەرەستەکانی ناوچەی حەسوونەی هەزارەی پێنجەمی پ.ز بکەین، تێبینیی ئەوە دەکەین کە کەرەستەکانی حەسوونە هەر ئەو کەرەستانەی ناوچە چیاییەکانن بەڵام بەشێوەیەکی پێشکەوتووتر، دیارە کۆچکردنی چەرموویییەکان بۆ حەسوونە و نیشتەجێ بوونیان لەوێدا کە هەزار ساڵ زۆرتری پێ چووە، بەحوکمی بەرەو پێشچوونی رەورەوەی شارستانی دەبێت پەرە بەو کەرەستانە بدەن و پێشیان بخەن.

لەپاش هەزارەی پێنجەمی پێش زایینەوە و لە ناوچەکانی چینەکانی سەرووی حەسوونە و هەروەها سامەڕا و ئاریدۆ و قەڵای حاجی محەمەددا کە مێژوویان بۆ دەوروبەری (٤٥٠٠) پ.ز دەگەڕێتەوە، هەر ئەو کەرەستانەی کە حەسوونەییەکان لە ناوچە چیاییەکانەوە وەریانگرتووە، زۆرتر پێش خراوە لە ماوەی ئەو پێنج سەد ساڵەدا و پاشان ئەم پێشکەوتنە زێتر لەو کەرەستانەدا بەدی دەکەین لە گردی (خەڵەف) و ماوەی



21 چەند گڵێنەیەکی شاری ئاریدۆ





(عەبید)دا کە مێژوویان بۆ هەزارەی چوارەمی پ.ز دەگەڕێتەوە، ئەو لێکۆڵینەوەیەی کە زانایانی ئارکیۆلۆژی (دێڤید و جوان ئۆتیس) لەسەر دەفر و ئامانەکانی ماوەی (عەبید) کردوویانە، وای لێ کردوون کە بڵێن رەسەنی ئەو کەرەستانە دەگەڕێتەوە بۆ ئێران (دیارە مەبەستیان ناوچەکانی خۆرهەڵات و باکووری خۆرئاوای ئێرانە، واتە خۆرهەڵاتی کوردستان)[1].

بەو شێوەیە تا بەرەو خوار بێین و لە مێژوودا بەرەو پێش بڕۆین پێشکەوتنی زێتر لەو کەرەستانەدا بەدی دەکەین تا دەوروبەری هەزارەی سێیەمی پێش زایینداکە لە ئۆڕۆکدا ئەو کەرەستانە بەشێوەیەکی زۆر پێشکەوتووتر و زۆر رێکوپێکتر دەبینین.

لە ڕاستیدا شاری ئۆڕۆک بەنێو جەرگە و پێشکەوتووترین شاری سۆمەری دادەنرێت، هەر هەمان لێکۆڵینەوەی زانایان (دێڤید و جوان ئۆتیس) ئەوەی دەرخستووە کە لە باشووری کوردستاندا رێژەیەکی زۆر لە کەرەستەی شارستانییەکانی ئۆڕۆک هەن بۆ نموونە ناوچەی (گردی رەش)ی نزیک ژەنگار و قالینج ئاغای هەولێر و ناوچەکانی نزیک رانیەی سلێمانی و هێندێک شوێنی تریش کە هەر بەتەواوەتی هاوچەشنن لەگەڵ فەخفورییەکانی ئۆڕۆکی سۆمەریدا[2] بەڵام ئەم فەخفورییانەی کوردستان تەمەنیان لەوانەی ئۆڕۆک زێترە واتە کۆنترن، کە ئەوە دەگەیەنێت رەسەنی ئەم فەخفورییە سۆمەرییانە لە چیاکانی کوردستانەوەیە. زانا و مێژوونووس دڕایڤەر – G. R. DRIVER لە بارەی وێکچوونی ئەم کەرەستانەوە وا دەڵێت: کۆنترین شوێنەوار و ئاسەواری کوردەکان، ئەو گڵێنە و سواڵەتە سۆمەرییانەن کە لەژێر هەرددا بینراونەتەوە و دەگەڕێنەوە سەر سێ هەزار ساڵ بەر لە دایکبوونی عیسا... و لەسەر هێندێکیان وشەی کاردا – KARDA دەخوێنرێتەوە، هەروەها یەکێک لەو گڵێنانە، سەردەمی پادشایەتیی شو – سین SHU - SIN کە دەچێتەوە سەر ئور UR پیشان دەدا (١٩٧٨ پ.ز) و کارداکای KARDAKA لەسەر دەخوێنرێتەوە[3].

زنجیرەی پێشکەوتن و لەیەکچوونی ئەو کەرەستە ئارکیۆلۆژیانە و لەهەر ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر، کە خاڵی سەرەتا و دروستبوونی لە

چیاکانی کوردستان دایە، بەڵگەیەکی ماددی و ئارکیۆلۆژیی زۆر گرنگە بۆ گواستنەوەی شارستانی لە باکوورەوە بۆ باشوور و پاشان بردنەوەی ڕەسەنی سۆمەرییەکان بۆ چیاکانی کوردستانیش دەسەلمێنێت.

### بەڵگەی دووەم: زمانی سۆمەرییەکان

زمان، هەروەکو هەموومان دەزانین هۆیەکە بۆ ئاخاوتن و لە یەکگەیشتنی مرۆڤ، زمانی سۆمەری کۆنترین زمان نییە لە مێژوودا هەروەکو چۆن سۆمەرییەکان خۆشیان کۆنترین نەتەوەی مێژوو نین، بەڵام زمانی




22

چەند کەرەستەیەکی ئارکیۆلۆژیی حەسسونە و حەلەف و عوبەید





سۆمەرییەکان کۆنترین زمانە کە بەهۆی نووسینی مێخییەوە نووسرابێتەوە و بەدەست ئێمە گەیشتبێت، بێگومان نووسین بەشێوەیەکی وێنەیی هەروەکو پرۆفیسۆر گرامەر دەڵێت (لە وڵاتی سۆمەردا لە کۆتایی هەزارەی چوارەمی پێش زایینیدا دەستی پێ کردووە، وردە وردە شێوەی مێخیی سەندووە) ئەم دیاردە شارستانییەی سۆمەرییان لەنێو میللەتانی دی دەوروبەری خۆیاندا بڵاوبۆتەوە و سوودێکی گرنگی گەیاندۆتە لێکۆڵینەوەی مێژوویی ئەو هەرێمانە، کە ئەمڕۆ بەعێراق و ئێران و تورکیا و سوریا و لوبنان و فەلەستین نێودارن(٤).

سۆمەرییەکان بەهۆی داهێنانی ئەم نووسینە مێخییەوە زۆربەی زمان و ئەدەب و کاروباری ڕۆژانە و ماددە یاسایی و نامە پادشاییەکانی خۆیان تۆمار کردووە، لە دەوروبەری هەزارەی سێیەمی پ.ز دا نووسینی مێخی بەتەواوەتی لە وڵاتی سۆمەردا بەشێوەیەکی پێشکەوتوو بڵاوبووەتەوە، ئەم سۆمەرییانە بەهۆی پارچە دارێک یاخود قامیشێکی سێ چوکڵەییەوە لەسەر تەختە قوڕی پاک کە بۆ ئەو مەبەستە ئامادەکراوە نووسیویانە و پاشان لە کورەی تایبەتیدا ئەو تەختە قوڕینانەیان سوور کردووەتەوە، بۆ ئەوەی تا ماوەیەکی باش بمێنێتەوە و لە شکان ڕزگاریان ببێت.

زمانی سۆمەرییەکان زمانێکی داڕێژراوە و تاوەکو ئێستا نەزانراوە سەر بەکام گرووپی زمانەکانە(٥).

زمانە هیندوئەورووپییەکان و لەنێو ئەوانیشدا زمانی کوردی دیاردەی داڕشتنی تێدایە هەروەکو زمانی سۆمەرییەکان، بەڵام تاوەکو ئێستا لێکۆڵینەوەیەکی چڕوپڕی وا لەلایەن ئەو زانا زمانەوانانەوە نەکراوە کە لە زمانی سۆمەری و زمانە کۆن و نوێیەکانی تردا پسپۆڕن و هەوڵی دۆزینەوەی ڕەسەنی زمانی ئەم سۆمەرییانە بدەن، یاخود بەهێزترین پەیوەندی لەنێوان زمانی سۆمەری و زمانێکی تردا دیاری بکەن.

هەرچەندە زمانی سۆمەرییەکان و زمانە سامییەکانی دیکە هەندێک زاراوە و وشەی یەکتریان پەڕیوەتە نێو زمانەکانیانەوە بەڵام زمانی سۆمەرییەکان بەهیچ جۆرێک پەیوەندیی لەگەڵ زمانە سامییەکاندا نییە و

نەژادی ناچێتەوە سەر ئەوان.

لە هەزارەی دووی پ.ز دا بنەماڵە و فەرمانڕەوای سۆمەر بەیەکجاری ماڵئاوایی لە مێژوو کرد، بەڵام زمان و ئەدەبی سۆمەرییەکان هەر مایەوە و سامییەکان بوونە خاوەنی. هەرچەندە زمانی سۆمەرییەکان وەک ئاخافتن بەرەبەرە کەم بووەوە و تا وای لێ هات بەکار نەدەهێنرا بەڵام ئەدەبەکەیان هەر مایەوە و پەرچڤەی زمانە سامییەکانی تری وەک ئەکەدی و بابلی و ئاشووری کرا، زمانی سۆمەریش وەک زمانی زانست تاوەکو لە دایکبوونی مەسیح لەسەر تەختە گڵەکان و شان بەشانی زمانەکانی تر، تێکستە ئایینی و ئەدەبی و سیاسییەکانی پێ نووسراوەتەوە.

زمان باشترین و بەڵگەدارترین سەرچاوەیە بۆ لێکۆڵینەوەی مێژوویی، بەهۆی زمانەوە دەتوانین زۆربەی گرێ کوێرە مێژووییەکان بەدەربخەین، ئەگەر بەهۆی زمان و دۆزینەوەی هێما مێخییەکانی سەر تەختە گڵەکانەوە نەبوایە، ئێمە ئێستا بەشێکی زۆر زۆر کەمی مێژووی ناوچەکەمان دەزانی و سەرچاوەشمان بۆ لێکۆڵینەوەی مێژوویی ناوچەکە تەنها کەرەستە ئارکیۆلۆژی و کتێبەکانی وەک تەورات و هیرۆدۆت و هێندێکی تر دەبوو، کەواتە زمان ڕۆڵێکی زۆر ترسناکی لە مێژوو و مێژووانیدا بینیوە.

دەربارەی زمانی سۆمەری، د. پاکیزە کە دێتە سەر ڕەسەنی هەردوو زمانی ئیلامی و سۆمەری دەڵێت: «بەلای منەوە هیچ دوودڵیم نییە لەوەدا کە هەردوو زمانەکەش زمانی زاگرۆسین، هەریەکەیان لە شوێنی خۆیدا پشکوتووە لە شێوەی گفتوگۆوە، کە نووسین پەیدابووە، زمانێکی سەربەخۆی لێ پەیدا بووە، ڕاستە جیاوازی هەیە لە بەینی هەردوو زمانەکەدا بێگومان هەریەکە لە شێوەیەکەوە کەوتۆتەوە، هەر یەکێکیشیان لە شوێنێکی جیادا نیشتەجێ بووە و نزیک هەزار ساڵێک زەمانیش لە یەکی دوورخستوونەوە. ئێستا دوو شێوەی زمانێکی زندوو لە هەندێ زماندا ئەوەندە لەیەک دوورن کە زۆر بەئاسانی لەیەک ناگەن. هەردوو زمانەکە - سۆمەری و ئیلامی - بەزمانی کەرتەیی - SYLLABIC دادەنرێن واتە - هەموو وشەیێک لە کەرتەییێک پەیدا دەبێ یا چەند





کەرتەییێک، کە بۆ یەک مانا دەست بدا»[٦].

مامۆستا (تۆفیق وەهبی)ش لەم بارەیەوە دەبێژێت: (ئەو پیتە بزوێنانەی کە لەو وشە کۆنانەدا هەن، بۆ من زۆر جێی سەرنجن. من وای بۆ دەچم کە پیتە بزوێنەکانی I و U لە پێگەیشتن و گەشەکردنی AKA وە پێکهاتوون ئەگەر بەهەڵە نەچووبم دەکرێ بڵێین: KARD - A و GORD - I کە درایڤەر (مێژوونووسە) نێوی بردوون، پێگەییو و گۆڕاوەی ماکی کارداکا KARDAKAن کە لە رووی سواڵەتەکانی سۆمەریدا، بینراونەتەوە و خوێنراونەتەوە. پلەی ئەو گۆڕان و پێگەیشتنە و گەشەکردنە، بەجوانی لەنێوان شێوەکانی کرمانجیدا بەرچاو دەکەون. بنەڕەت و بناخەی جیاوازێکی کە لەنێوانیاندا دەبینرێ، چۆنیەتی پلەی ئەو گۆڕان و پێگەیشتنەیە)[٧].

سۆمەرییەکان نەتەوەیەکی چیایی بوون، بەڵگەیەکی گرنگی زمانەوانی ئەمە دەسەلمێنێت کە ئەویش ئەوەیە کە ئەم سۆمەرییانە وشەی (کوڕ - KUR) بۆ هەردوو واتای (چیا - شاخ) و (نیشتمان) بەکاردەهێنن[٨]. ئاشکرایە کە بەکارهێنانی ئەم زاراوەیە واتە کوڕ بۆ چیاش و بۆ نیشتمانیش بەڵگەیەکی زمانەوانیی بەهێزە کە لەوەوبەر پێش ئەوەی لە ناوچەی دەشتی لیتەییدا نیشتەجێ بن لە ناوچە چیاییەکاندا ژیاون و، کە بەرەو خواریش بوونەتەوە بەناوچە نیشتەنییە نوێیەکەیان گوتووە (کوڕ) هەر بەیادی چیاکانەوە. چیاکان نیشتمانی سۆمەرییەکان بووە لەبەرئەوەی کە نێوی چیا یاخود (کوڕ)یان هێناوە واتە نێوی نیشتمانەکەیان هێناوە و پاشانیش هەرچەندە لە ناوچە چیاییەکان دوور کەوتوونەتەوە و لە تەختانیدا ژیاون بەڵام چیاکانیان هەر لە لا بەپیرۆزی ماوەتەوە و نێوی ئەم نیشتمانە نوێیەشیان هەر بەنێوی چیاکانەوە بانگ کردووە. ئەوەی شایانی باسە کە وشەی (کوڕ)ی سۆمەری کە واتای چیا دەگەیەنێت زۆر لە وشەی (کێو)ی کوردییەوە نزیکە کە هەمان واتای هەیە شایانی باسە خەڵکی شاری سنە و دەوروبەری بەکوردستان دەڵێن کورسان. کێ دەڵێت ئەم (کوڕ)ە هەر هەمان (کوڕ)ی سۆمەری نییە!.

بەڵام ئەوەی زێتر رەسەنی سۆمەرییەکان لە کوردستاندا پتەوتر دەکات بوونی چیایەکە لە ناوچەی سەر زێی بچووک لە نزیک گوندی کانی توو لە پشدەر(٩) کە هەر بەنێوە کۆنەکەی خۆی ماوەتەوە ئەویش چیای (کوڕکوڕداخ)ە. نێوی ئەم چیایە زۆر کۆنە و دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سەردەمەی کە سۆمەرییەکان کۆچیان بۆ دەشتی لیتەیی کردبێت، یاخود ئەو سەردەمەی کە سۆمەرییەکان لە دەوروبەری چیای کوڕکوڕداخدا ژیابێتن. وشەی کوڕی سۆمەری کە واتای چیا و نیشتمان دەگەیەنێت هەر نێوی ئەو چیایەیە کە بەدرێژایی مێژوو بەنێوی خۆیەوە ماوەتەوە کە لەوانەیە تەنها پاشگری (داخ)ی بۆ زۆر کرابێت و هیچ جیاوازییەک لەنێوان وشەی (کوڕ)ی سۆمەری و نێوی چیای (کوڕ کوڕداخ)ی ئەمڕۆی باشووری کوردستاندا نییە، لە یەکچوونی ئەم دوو زاراوەیە و بەهەمان واتا گەورەترین بەڵگەی زمانەوانییە کە کاتی خۆی سۆمەرییەکان لە ناوچەی کوڕ کوڕداخدا ژیابێتن.

هەروەها ئەوەی زێتر چیایێتیی سۆمەرییەکان دەسەلمێنێت وێنەی ئەو درەخت و ئاژەڵە شاخاوییانەیە کە لەسەر مۆرە لوولەییەکان هەڵیان کەندووە، بۆ نموونە لەسەر هەندێک لەو مۆرە لوولەییانە درەختی سەروو و سنۆبەر دەبینین و ئاشکرایە کە ئەم جۆرە درەختانە لە ناوچە شاخاوییەکاندا نەبێت نییە، کوردستانیش لەبەرئەوەی لە چاخی بلایستۆسیندا زۆربەی ناوچەکانی بەفر و بەستەڵەک بووە باشترین درەخت کە لەو ئاووهەوایەدا ژیابێت درەختی سەروو و سنەوبەر بووە، نزیکترین ناوچە لە سۆمەرییەکانەوە کە ئەم جۆرە دارانەی تێدا رووابێت ناوچەی چیاکانی زاگرۆسی کوردستانە، ئەوەی شایانی باس بێت ئەم جۆرە درەختانە هەتاوەکو ئێستاش بەشێوەیەکی خۆڕسک لە ناوچەکانی دهۆکی باشووری کوردستاندا بەشێوەی دارستانی گەورە لە لاپاڵی چیاکاندا بەرچاومان دەکەون، وێنەکردنی ئەم جۆرە دارانە لەسەر مۆرە لوولەییەکانی سۆمەرییەکان و شان بەشانی نووسینە مێخییەکان ئەوەمان بۆ دەردەخات کە ئەم درەختانەیان لە لا پیرۆز بووبێت و کاریان لە سۆمەرییەکان کردبێت بەو سیفەتەی کە ئەم درەختانە لە نیشتمانی یەکەمینی سۆمەرییەکاندا





واتە (کوردستان) خزمەتی باپیرانی سۆمەرییەکانیان کردبێت و لە زستانی سارددا گەرمی کردبێتنەوە و خانوو و کەرەستەی شارستانییی تریان لێ دروست کردبێت.

جگە لەو درەختە چیاییانە وێنەی بەران و بزنە کێویش لەسەر ئەو مۆرە لوولەییانە دەبینین، کە ئەوە دەگەیەنێت کە کاتی خۆی لە ناوچەی چیاکاندا راوی ئەم ئاژەڵانەیان کردبێت و رەفتاریان لەگەڵدا کردبێتن. ئەو بەران و بزنە کێوییانەی کە سۆمەرییەکان وێنەیان کێشاوە زۆر جیاوازییان لەگەڵ مەڕ و بزنی ناوچەی دەشتی لیتەییدا هەیە، شێوە و روخساری ئەو



23

مۆرێکی لوولەیی کە وێنەی چەند ئاژەڵێکی کێویی لەسەرە



24

مۆرێکی تری لوولەیی کە وێنەی چەند ئاژەڵێکی کێویی لەسەرە

ئاژەڵانە بەتەواوەتی لەوانە دەچن کە تاوەکو ئەمڕۆش لە چیاکان و ناوچە هەرە سەختەکانی کوردستاندا دەژین.

من لێرەدا بەتەواوەتی ناڵێم زمانی سۆمەری و زمانی کوردی یەک زمانن، بەڵام ئەوەندە دەڵێم زمانی سۆمەرییەکان یان هەمان زمانی کوردستانییە کۆنەکان بووە یاخود زۆر نزیکی یەکتربوون و دوو شێوە زمانی (دیالێکت) یەک زمان بوون. ئەو نزیکییەی کە ئەمڕۆ لەنێوان چەندین زاراوەی زمانی سۆمەری و زمانی کوردیدا هەستی پێ دەکەین، لە هیچ زمانێکی تردا هەستی پێ ناکەین ئەگەر بێت و بەراوردی بکەین لەگەڵ زمانی سۆمەریدا. بۆ نموونە لە زمانی سۆمەریدا دووانە یاخود (مثنی) نییە، هەروەکو چۆن لە کوردی و زمانە هیندوئەوروپییەکانی تریشدا نییە، هەروەها لە سۆمەریدا نێوی بێ لایەن هەبووە، هەروەکو چۆن ئەمڕۆ لە کوردیشدا هەیە بۆ نموونە (بەرد، خشت، دار...)، ئەمانە نێوی بێ لایەنن.

بەداخەوە تاوەکو ئێستا پسپۆڕێکی زمانەوانیی وامان نییە کە پەیوەندیی نێوان زمانی سۆمەرییەکان و زمانی کوردی دیاری بکات و ئەو وشانەی کە لە هەردوو زمانەکەدا هەمان واتا و فۆنەتیکیان هەیە دەربخات، تەنها چەند کەسێکی کەم نەبێت کە ئەوانیش هەریەکە و لە چەند وشەیەکی کەمیان کۆڵیوەتەوە کە لە پەنجەکانی دەست تێپەڕ ناکات.

دکتۆر سپایزەر لە کتێبەکەی خۆیدا دەربارەی نێوە تایبەتییەکانی سۆمەری دەڵێت: دەشێت بڵێین کە لە سەردەمەکانی وڵاتی سۆمەردا، رەگەزی گۆتی هەر هەبووە کە ئەمەیان بێگومان رەگەزێکی کوردستانییە[١٠].

وا لێرەدا هەندێک لەو وشانە و چەند وشەیەکی تریش کە لە هەردوو زمانی سۆمەری و کوردیدا هەمان واتا و فۆنەتیکیان هەیە دەخەمە روو و هەروەها ئەو وشانەی کە تاڕادەیەک لە زمانی کوردییەوە نزیکن:

* ئا – A: لە سۆمەریدا بەواتای (ئاو) هاتووە.
* گو – GU: لە سۆمەریدا بە(گوێ – کەنار) هاتووە – بۆ نموونە (گوێ ئاو، گوێ چەم، کەناری ئاو).





* ساگ – SAG: لە سۆمەریدا بەواتای (سەر) هاتووە.
* کەڵەگا – KALAGA: لە سۆمەریدا هەر بەواتای (کەڵەگا)ی کوردی هاتووە، هەروەها بەواتای (بەهێز) یا (پاڵەوان)یش هاتووە کە لە کوردیشدا هەر بەو جۆرەیە.
* پابیلگە – PABILGA: لە سۆمەریدا بەواتای (باپیرە) هاتووە.
* نوموزو – NUMUZU: لە تێکستە سۆمەرییەکاندا بەواتای (نازانێ) یا (نازانم) هاتووە.

خۆی لە بنەڕەتیشدا (ZU) واتای (دەزانێ)یە کە لەکاتی کۆکردنەوەیشیدا دەبێ بە(زوزو – ZUZU) واتە زۆرزان.

* گودێئا – GUDEA: ئەم وشەیە، یا راستتر ئەم چەند برگەیە بەسۆمەری دەکاتە (ئەوەی قسان دەبێژێ) بەواتا (گوتی) یا (وتی)ی کوردی.
* مو – MU: جێناوە بەواتای (من)[١١].
* ئانێ – A - NE: جێناوە بەواتای (ئەو).
* ئانێ نێ – A - NE - NE: جێناوە بەواتای (ئەوان).
* مێ – ME: جێناوە بەواتای (ئێمە) یا (مە).
* ئاپن – APIN: لە سۆمەریدا بەواتای (گاسن) هاتووە کە زۆر لە (ئاسن) و (گاسن)ی کوردییەوە نزیکە.
* جوروش – GURUSH: بەسۆمەری واتە ئەو کەسەی کە باڵغ بێت یان هەر کەسێک کە توانای کارکردنی هەبێت، لە کوردیدا (جەسور)مان هەیە کە زۆر لە جوروشەوە نزیکە و کە هەر بۆ هێز و توانا بەکاردێت.
* کاڵ – KAL: لە سۆمەریدا بەواتای (بەهێز) دێت، لە کوردەوارییی خۆشماندا بە لاوان دەگوترێت (کوڕوکاڵ) کە سەرچاوەی بەهێزین لە کۆمەڵدا.
* ئان – AN: لە سۆمەریدا بەواتای ئاسمان هاتووە، ئانی سۆمەری و ئاسمانی کوردی زۆر لە یەکدییەوە نزیکن کە هەردووکیان یەک واتا دەبەخشن.
* باڵا – BALA: لە سۆمەریدا بەواتای (ماوەی فەرمانڕەوایی) هاتووە کە

یەکەیەکی پێوانەیە، لە کوردیشدا بالآ وەک یەکەیەکی پێوانە بەکاردیت.

* ئەمبار – AMBAR: لە سۆمەریدا بەواتای (زەلکاو) هاتووە واتە (مستنقع) ئەو شوێنەی کە ئاوی تێدا کۆدەبێتەوە، لە کوردیشدا (عەمبار) بۆ هەمان مەبەستی کۆبوونەوەی شمەک بەکاردێت بۆ نموونە (عەمباری ئاو، عەمباری ئازووخە...).
* ئە – E: لە سۆمەریدا بەمانای (ئەوە) هاتووە.
* ئوڕی – U - RI: لە سۆمەریدا بەواتای (ئەوڕۆ) هاتووە، یان (ئەمڕۆ)...
* زۆ – ZU: لە سۆمەریدا بەواتای (زانین – معرفە) هاتووە.
* می – MI: لە سۆمەریدا بەواتای (مێ) هاتووە.
* گا – GA: لە سۆمەریدا هەر بەواتای (گا) هاتووە.
* دینگار – DINGIR: لە سۆمەریدا بەواتای (خوداوەند) هاتووە کە یەکێکە لە گرنگترین رەگەزەکانی ئایین، وشەی (دین) سامی یاخود عەرەبی نییە لەبەرئەوەی لە قورئاندا هاتووە بەڵکو هەروەکو مامۆستا (مەسعود محەمەد) لە یەکێک لە نوسینە زمانەوانییەکانی خۆیدا دەڵێت زاراوەی (دین) کوردستانییە و لە کتێبی ئاڤێستا و نووسراوە کۆنەکانی تری کوردستاندا هەیە، کەواتە دینگاری سۆمەری و دینی کوردی هەردووکیان دوو زاراوەی ئایینن و زۆر پێکدەچن[١٢].
* کوڕ – KUR: لە سۆمەریدا بەواتای کێو هاتووە.
* ئەششا – ASHSHA: لە سۆمەریدا بەواتای ژمارە (شەش) هاتووە.
* ئش – ESH: لە سۆمەریدا بەواتای ژمارە (هەشت) هاتووە.
* هە – HA: لە سۆمەریدا بەواتای ژمارە (دە) هاتووە.

لە شێوە زمانی کرمانجی ژووروودا بەژمارە (دە) دەبێژن (دە ە) کە زۆر لە (هە)ی سۆمەرییەوە نزیکە.

* باڕ – BAR: لە سۆمەریدا بەواتای (بڕین)ی کوردی هاتووە.
* دو – DU: لە سۆمەریدا بەواتای قسەکردن هاتووە، زاراوەی (دوان)ی کوردی زۆر لە (دو)ی سۆمەرییەوە نزیکە، بەڵکو هەر یەکیشن چونکە رەگی (دوان) (دو)ە کە هەردووکیان یەک واتا دەبەخشن.





* سیپا – SIPA: لە سۆمەریدا بەواتای شوان هاتووە، وشەی (سەپان)ی کوردی زۆر لە (سیپا)ی سۆمەرییەوە نزیکە کە هەردووکیان دوو پیشەی لادێکانن.
* ئەسیر – A - SE - ER: لە سۆمەریدا بەواتای (گریان) هاتووە، وشەی (ئەسرین) کە واتای فرمێسک و گریان دەبەخشێت زۆر لە (ئەسیر)ی سۆمەرییەوە نزیکە.
* کی – KI: لە سۆمەریدا بۆ نیشاندانی (شوێن)ی شار و ناوچە بەکارهاتووە، لە کوردیشدا (کوێ) بۆ پرسیار و دیاریکردنی شوێن بەکار دەهێنن.
* ئومینا – OMINA: لە سۆمەریدا بەواتای (مەینەتی) هاتووە، مەینەتی کوردی و ئومینای سۆمەری زۆر پێکدەچن کە هەردووکیان یەک واتا دەبەخشن.
* دار: لە کوردیشدا هەر بەو شێوە و واتایەیە کە درەختیشی پێ دەگوترێت[١٣].
* کوڕ: لە سۆمەریدا مانای گۆڕ یاخود جیهانی خوارەوەی بەخشیوە[١٣].
* ئارو: واتە ئاو[١٣].
* کەش: واتە داری کاژ یان سەرو[١٣].
* کارداکا: سۆمەرییەکان بەکوردستانیان گوتووە (کارداکا) کە ئەم وشەیە گەلێک لە (کورد یان کاردۆخ)ەوە نزیکە. ئەم وشەیە لەسەر یەکێک لە تەختە گڵەکانی سۆمەرییەکاندا دۆزراوەتەوە کە مێژووی دەگەڕێتەوە بۆ هەزارەی دووەمی پ.ز[١٤]. بەڵام (درایڤەر) مێژووی ئەم تەختە گڵە دەگەڕێنێتەوە بۆ هەزارەی سێیەمی پ.ز[١٥].

بێگومان وشە و زاراوەی تری زۆر هەن کە لە زمانی سۆمەری و زمانی کوردیدا هەمان واتا و فۆنەتیکیان هەبێت یاخود لەیەکەوە نزیک بن بەڵام نەبوونی لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانییانە لەلایەن پسپۆڕانەوە و بەراورد نەکردنی ئەو دوو زمانە تا ئێستا رێژە و ژمارەی ئەو وشە لەیەکچووانە نەزانراوە و من لەو باوەڕەدام کە سەدان وشەی سۆمەری هەبێت کە

بەتەواوەتی لە زمانی کوردییەوە نزیک بێت یاخود لەو زمانانەوە نزیک بێت کە ئەمڕۆ بەدایکی زمانی کوردی دەناسرێن لەوانە زمانی میتانی و هوری و مادەکان. بەتایبەتی هەردوو زمانی هوری و میتانی کە ناوچەیەکی فراوانیان هەبووە و زۆرکۆنن و هێندێک تایبەتێتیی خۆیان لەنێو زمانی کوردی ئەمڕۆدا جێهێشتووە[١٦].

زمانی هووری کە زمانی کوردستانییە کۆنەکان بووە و هیچ پەیوەندییەکی بەجیهانی هیندوئەوروپاییەوە نەبووە[١٧] و زمانێکی سەربەخۆ بووە، شێوازی ئەم زمانە زمانی سۆمەرییەکانمان بیر دەخاتەوە کە ئەمیش سەر بەهیچ گرووپێکی زمان نەبووە و سەربەخۆ بووە، کە لەوانەیە لە زۆر شتدا لەگەڵ زمانی هووریدا یەک بگرنەوە.

زاراوەی تریش هەیە کە پەیوەست بوون بەنێوی خوداوەندەکانی سۆمەرەوە و لە زمانی کوردیدا هەمان واتا و شێوەیان هەیە و لە باسی ئایینی سۆمەرییەکاندا لێیان دەدوێم.

هەروەها هەندێک وشەی تری زمانە سامییەکانی وەک ئەکەدی و بابلی هەیە کە تائەمڕۆش لە زمانی کوردیدا بەکاردەهێنرێن بەبێ ئەوەی هەندێکیان لە زمانە سامییەکانی ئەم سەردەمەدا وەک زمانی عەرەبی و عیبری و هی تر بەکاربهێنرێن، بۆ نموونە زاراوەی (مەشکینۆم) کە لە عەرەبیدا بووەتە (مسکین) و لە کوردیدا بەواتای (مسکێن) هاتووە کە واتای هەژار یاخود وەک لە کوردەواریدا پیاوی ئاغا دەگەیەنێت. هەروەها وشەی (نۆپاندا) کە واتای خزمەتکارانی دەرباری پادشایەتی دەگەیەنێت و ئەمڕۆ لە زمانە سامییەکاندا نەماوە بەڵام لە کوردیدا بەشێوەی (نۆبەداران)دا هەر ماوە کە لەوانەیە ئەم وشانە کاتی خۆی سۆمەری بووبێتن و پەڕی بێتنە نێو زمانە سامییەکانەوە.

لە چیرۆکی ئافراندندا (دروستبوون – الخليقة) لە زمانی خوداوەند مەردۆخەوە ئەم چەند دێڕە لەسەر تەختە گڵەکانی دەخوێنینەوە:

*جانەوەر (وحش)ی (لۆلۆ) دروست دەکەم کە نێوی مرۆڤە.*

*بێ سڵکردنەوە مرۆڤی کێوی دروست دەکەم تا ببێتە لێپرساوی خزمەتکردنی خوداوەند تا خوداوەند بەئاسوودەیی بژی*[١٨].

ئەم دێڕانە زێتر رەسەنی یەکەمین مرۆڤ بۆ چیاکانی زاگرۆسی کوردستان دەباتەوە، چونکە نێوی ئەو جانەوەرەی کە لەو دێڕانەدا هاتوون (لۆلۆ) هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ نێوی نەتەوەی (لۆلۆ)دا نییە کە لە هەزارەی پێنجەمدا لە کوردستاندا ژیاون. سۆمەرییەکان بەمرۆڤی یەکەمینیان گوتووە (لۆلۆ) کە لای سۆمەرییەکان نەتەوەیەکی پیرۆز بوون و بەسەرچاوەی سۆمەر و هەموو نەتەوەکانی تریان داناوە، ئەمەش بەڵگەیەکی ترە کە سۆمەرییەکان رەسەنی خۆیان بەچیاکانی کوردستانەوە دەبەستنەوە.

**بەڵگەی سێیەم: بەراوردێک لە نێوان دراوسێکانی وڵاتی سۆمەرییەکاندا**

ئەگەر بێت و سەرنجێک لە نەخشەی کۆنی ناوچەی خۆرهەڵاتی نزیک بدەین، شوێنکەوتەی سۆمەرییەکانمان بۆ دەردەکەوێت لەنێوان دراوسێکانیاندا، باشووری وڵاتی سۆمەر کە بەنیمچە دوورگەی عەرەبی ناسراوە هەر لە کۆنەوە نیشتمانی ئەو نەتەوانە بوون کە پێیان دەگوترێت سامییەکان.

تەواوی زانایانی ئارکیۆلۆژی لەسەر ئەوە رێککەوتوون کە سۆمەرییەکان سامی نین، چونکە سامییەکان لە هەزارەی سێیەمی پ.ز دا لە دوورگەکەیان هاتوونەتە دەرەوە و بەرەو ناوچەکانی دەشتی لیتەیی و وڵاتی شام کۆچیان کردووە و نیشتەجێ بوون، بەڵام مێژووی سۆمەرییەکان و شارستانییەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ دەوروبەری نێوان هەزارەی پێنجەم و چوارەمی پ.ز، دوایی بەرەبەرە سامییەکان تێکەڵاوی سۆمەرییەکان بوون و لە بۆتەی شارستانیی سۆمەردا تواونەتەوە، بەڵام زۆریی ژمارەی ئەو سامییانەی کە لە دوورگەکەوە کۆچیان کردووە وای کردووە کە ببنە زۆرینەی خەڵکی دەشتی لیتەیی، تا وای لێ هات لە دەوروبەری (2400) پ.ز دا سامییەکان بەسەرۆکایەتیی (سەرگۆنی ئەکەدی) بۆ ماوەیەکی کاتی دەستیان بەسەر وڵاتی سۆمەردا گرت و بوونە فەرمانڕەوا تێیدا.

لە خۆرهەڵاتی وڵاتی سۆمەردا ئیلامییەکان لە چیاکانی زاگرۆسی



25 نەخشەی دراوسێکانی وڵاتی سۆمەر

کوردستاندا ژیاون کە ئێستا بەناوچەکانی لوڕستان و لەکستانی خۆرهەڵات و هەرە باشووری کوردستان بەنێوبانگە، ناوچەکانی ئەم ئیلامییە کۆنانە چەندین پاشەڕۆکی ئارکیۆلۆژیی تێدا دۆزراوەتەوە کە مێژوویان دەگەڕێتەوە بۆ چاخی بەردینی نوێ و زۆربەی ئەو کەرەستانە وەک ئەوانە وایە کە لە ناوچەکانی چەرمۆو و جۆگەمامی و زاوی چەمی و چەندان ناوچەی تری باشوور و نێوەڕاستی کوردستاندا دۆزراوەتەوە کە ئەوە دەگەیەنێت ئەم ئیلامییە کۆنانە یاخود مرۆڤە کۆنەکانی بەر لە ئیلام کە لە باشووری چیاکانی زاگرۆسدا ژیاون هەر ئەو شانەدەرییانەن کە لە ناوچەی حەسارۆست و چیاکانی تردا ژیاون و بەرەو چیاکانی باشوور رەویان





کردووە. پەیوەندی نێوان سۆمەرییەکان و ئیلامییەکان زۆربەی کات ناخۆش بووە و هەر لە شەڕ و ئاژاوەدا بوون چونکە هەریەکەیان لەلای خۆیەوە ویستوویەتی نیشتمانی ئەوی تر داگیر بکات و زەوییەکانی خۆی پێ فراوان بکات.

زمانی ئیلامییەکان و سۆمەرییەکان ناچنەوە سەر یەک و بگرە زۆر جیاوازیشیان هەیە تەنها ئەوە نەبێت هەندێک زاراوە بەحوکمی هاوسێیەتییان پەڕیوەتە نێو زمانەکانیانەوە، بەپێی پاشەڕۆکی ئارکیۆلۆژیی هەردوولا و نزیکییان لە یەکترەوە بەتایبەتی لە ئایین و هونەر و بیناسازی و شێوەی پەرستگاکانیاندا زۆر ڕێی تێ دەچێت کە ئەم دوو نەتەوەیە لە کۆندا یەک رەگەز بووبێتن، بەڵام بەهۆی جیاوازیی زمانەکەیان و هەندێک کەرەستەی ئارکیۆلۆژیی ترەوە تا رادەیەک رەگەزی سۆمەرییەکان و ئیلامییەکان لە یەکدی دوور دەخاتەوە.

لە خۆرهەڵاتی وڵاتی ئیلامییەکانەوە بەماوەیەکی دوور دۆڵی سند و باشووری بلوخستان دێت، کە بەسەدان کیلۆمەتر لە ئیلامییەکانەوە دوورە، چ جای بۆ وڵاتی سۆمەرییەکان، ئەم دۆڵی سند و باشووری بلوخستانە ناچنە ریزی دراوسێکانی وڵاتی سۆمەرەوە، بردنەوەی رەسەنی سۆمەرییەکان بۆ سەر ئەو ناوچانە تا ئێستا مشتومڕی لەسەرە و بەهیچ جۆرێک نەسەلمێندراوە.

لە باکووری وڵاتی سۆمەردا کە ئێستا باشوور و نێوەڕاستی کوردستانی پێ دەڵێن، هەر لە چاخی بەردینی نوێوە تا پێش نیو ملیۆن ساڵ شانەدەرییەکانی تێدا ژیاون پاشان بوونەتە نیشتمانی نەتەوەکانی وەک (لۆللۆ و گۆتی و کاشی و میتانی) و چەندانی تریش، ئەو پەیوەندییەی کە لە نێوان سۆمەرییەکان و ناوچەکانی ئەو نەتەوە نێوبراوانەدا هەیە کە هەروەکو لە بەڵگەکانی تردا باس کراوە وامان لێ دەکات کە بەبێ سڵکردنەوە بڵێین کە ئەم ناوچەیە یەکەمین نیشتمانی سۆمەرییەکان بێت کە لە هەزارەی پێنجی پ.ز وە کۆچیان بۆ دەشتە لیتەیییەکانی باشووری میزۆپۆتامیا کردبێت، هۆکارە جیۆگرافییەکان و بەتایبەتی نزیکیی وڵاتی

سۆمەر لەم ناوچانەوە زێتر راستیی ئەو رایە دەسەلمێنن.

دەربارەی پەیوەندیی نێوان ئەم نەتەوانەی کوردستان و سۆمەرییەکان: دکتۆر سپایزەر، کە لە مێژووی گەلانی میزۆپۆتامیادا پسپۆڕە دەڵێت: کە نەوەی گۆتییەکان لە وڵاتی سۆمەردا ژیاون پێش ئەوەی کە سۆمەرییەکان بەکاتێکی کەم فەرمانڕەوایی خۆیانیان تێدا دابمەزرێنن... پاشان گەڕاونەتەوە بۆ نیشتمانە کۆنەکانی خۆیان کە چیاکانی زاگرۆسە. هەندێکی تریش دەڵێن بەڵکو گۆتییەکان پێش سۆمەرییەکان دەستیان بەسەر وڵاتی سۆمەر و ئەکەددا گرتووە لەوانە مامۆستا ئەمین زەکی بەگ[١٩].

بوونی گۆتییەکان لە پێش سۆمەرییەکاندا لە ناوچەکانی دەشتی لیتەییدا زێتر پەیوەندیی کوردستان و سۆمەر بەیەکەوە گرێ دەدات، خۆ ئەگەر سۆمەرییەکان نەوەی ئەو گۆتییانە نەبووبێتن ئەوا پەیوەندییەکی زۆر بەهێز لەنێوانیاندا هەبووە، پەیوەندیی هاونیشتەنی یاخود هاوزاگرۆسی و هاوکوردستانی لە پێشەوەی ئەو پەیوەندییانەیە.

لە باسی هۆکارە جیۆگرافییەکان و دراوسێکانی وڵاتی سۆمەردا نابێت نەتەوەی یاخود کۆمەڵە خەڵکی (فوراتییە سەرەتاییەکان)یش لە بیر بکەین، کە هەروەک باس کرا لە حەوزی رووباری فورات و دەشتی لیتەییدا لەنێوان هەزارەی شەشەم و پێنجەمی پ.ز دا لەو ناوچانەدا نیشتەجێ بوون. تا ئێستاش کەس رەسەنی سۆمەرییەکانی نەبردۆتەوە سەر ئەم فوراتییە سەرەتاییانە کە بۆ یەکەم جار لە خۆرئاوای وڵاتی سۆمەرییەکاندا نیشتەجێ بوون، ئەم فوراتییانە لە ناوچەکانی چیاکانی کوردستانەوە بەرەو خوار رەویان کردووە کە لەوانەیە ئەمانە یەکەم کەس بووبێتن لە دوای چیاکان لەم ناوچانەدا نیشتەجێ بووبێتن، چونکە تاوەکو ئێستا هیچ کەرەستەیەکی ئارکیۆلۆژیی لە هی ئەم فوراتییە سەرەتاییانە کۆنتر لە ناوچەکەدا نەدۆزراوەتەوە. بەهۆی کەمیی ئەو کەرەستە ئارکیۆلۆژییانەی کە پەیوەستن بەم فوراتییانەوە ناتوانرێت رەسەنی سۆمەرییەکانی ببردرێتەوە سەر، هەر چەندە زۆربەی ئەو کەرەستانەی کە





دۆزراونەتەوە بەتەواوەتی لە هی سۆمەرییەکان دەچن بەشێوەیەکی کۆنتر. بەڵام ئەوەی کە بەڵگە نەویست بێت ئەم فوراتییە سەرەتاییانە هەر ئەو کۆمەڵە خەڵکانەن کە لە گوندەکانی کوردستاندا ژیاون، هەر لە هەزارەی حەوتەمەوە بەرەو نیو ملیۆن ساڵ.

ئێستا ئێمە لەبەردەم دوو رادایین: رای یەکەم ئەوەیە شانەدەرییەکان کۆچیان بۆ ناوچەی حەوزی فورات کردبێت و شارستانییان بەرەو پێش خستبێت و پاشان بەرەو دەشتی لیتەیی کشابێتن و بووبێتنە هۆی دامەزرێنەری وڵاتی سۆمەری و شارستانێتییان گەیاندبێتە ئەو پلەیەی کە لە ماتماتیکدا بیردۆزی فیساگۆرس دابرێژن و رای دووەمیش ئەوەیە کە یەکسەر لە ناوچەکانی چیاکانەوە بەرەو دەشتی لیتەیی کۆچیان کردبێت. ئینجا رای یەکەم راست بێت یان دووەم، باوەڕ ناکەم جیاوازییەکی ئەوتۆی هەبووبێت، کورد واتەنی هەموو رێیەکان دەچنەوە سەر بانە و رەسەنی سۆمەرییەکان چیاکانی کوردستانە.

لەپاش باسکردنی هەموو دراوسێکانی وڵاتی سۆمەر بۆمان دەرکەوت کە چیاکانی زاگرۆسی کوردستان نزیکترین و گونجاوترین شوێنن، کە سۆمەرییەکان بۆ دەشتی لیتەیی کۆچیان لێوەی کردبێت.

**بەڵگەی چوارەم: ئایینی سۆمەرییەکان**

ئایین، رۆڵێکی زۆر ترسناکی لە ژیانی رۆژانە و مێژووی سۆمەرییەکاندا بینیوە، مرۆڤی کۆن بەئایینیترین کۆمەڵگەی مێژوو دادەنرێت، بوونی ئەو هەموو پەرستگا و خوداوەند و پەیکەر و زەکوورانە ئەم راستییەمان بۆ دەردەخات. زێوانی پەرستگاکان باشترین پایەیان لە کۆمەڵگەی سۆمەریدا هەبووە، تەنانەت پادشا سۆمەرییەکانیش بەشێوەیەکی فەرمی بەشدارییان لە کاروباری ئایین و پەرستگاکاندا کردووە، بۆ نموونە (ژنهێنانی پیرۆز) کە دابێکی ئایینیی گرنگ بووە و ساڵانە لەلایەن پادشاوە ئەنجام دراوە. کاروباری بەڕێوەبردنی پەرستگاکان و بەتایبەتی پەرستگا مەزنەکان راستەوخۆ لەلایەن دەرباری پادشاییەوە بەڕێوەبراوە و زێوانی مەزنیش

(EN – الکاهن الاعلی) هەر لەلایەن پادشاوە دامەزراوە، ئایین و خوداوەندەکان کارێکی ئەوتۆی لە ژیانی کۆمەڵگەی سۆمەریدا هەبووە بەڕادەیەک کە زۆربەی پادشاکان کوڕێک یان کچێکی یاخود ژنی خۆیانیان کردووەتە زەیوانی پەرستگاکان تاوەکو خوداوەند و گەل لێیان رازی بێت. هەروەکو چۆن، پادشا (میسانیپادا)ی فەرمانڕەوای (ئور) ژنەکەی خۆی کردووەتە زەیوانی مەزنی پەرستگای خوداوەند (سن) لە ئور. تەنانەت سەرگۆنی ئەکەدیش رێزێکی گەورەی لە دامەزراوە ئایینییەکانی سۆمەرییەکان گرتووە، و کیژێکی خۆیی کردووەتە زەیوانی خوداوەند (نانا)، خوداوەندی مانگ لە شاری ئور. هەروەها بۆ ئەوەی پادشای ئەکەد بیسەلمێنێت کە ناتوانێ دابونەرێتە پیرۆزە کۆنەکان بشکێنێ، نازناوی (زەیوانی – ئانۆ – و ئەنسی «ئەنلیل»ی گەورە)ی لە خۆی ناوە[٢٠].

پادشاکانی سۆمەر لە قوولایی باوەڕیانەوە گەورەترین هەوڵیان داوە بۆ هێنانی باشترین وەستا و چاکترین کەرەستە بۆ دروستکردنی پەرستگای خوداوەندەکانیان. داهاتێکی زۆر بۆ بەڕێوەبردنی ئەم پەرستگایانە لەلایەن سۆمەرییەکانەوە تەرخان کرابوو، کە گەیشتبووە چارەکی هەموو زەوییەکانی وڵاتی سۆمەر[٢١].

ئایینیش وەک گرنگترین کەرەستە گیانییە شارستانییەکانی تر مێژوونووسان بۆ لیکۆڵینەوەی مێژوو و نەتەوە کۆنەکانی بەکاریان هێناوە، چونکە زۆربەی بیروباوەڕ و لایەنە کۆمەڵایەتییەکانی دیکەی کۆمەڵگە کۆنەکانی بەدەردەخات.

ئەگەر بێت و بەراوردێک لەنێوان ئایینی سۆمەرییەکان و کوردستانییە کۆنەکاندا بکەین زۆر لایەنی لە یەکچوو و نزیکمان بۆ دەردەکەوێت بەڕادەیەکی وا کە هەر بەبەراوردکردنی ئایینی هەردوولا بێ سێ و دوو دەتوانین بڵێین کە ئایینی سۆمەرییەکان لە بنەڕەتدا ئایینی نەتەوەکانی چیاکانی زاگرۆسی کوردستان بووە.

هەر لە بەرەبەیانی شارستانییەوە و بەتایبەتی لە چاخی بەردینی نوێوە کە سەردەمی نیشتەجێ بوونی شانەدەرییەکانە لە گوندەکانی وەک بەردە





بەڵەک و پاڵەگەورە و چەرمەوو و جۆگەمامی و زاوی چەمی و چەندانی ترەوە، مرۆڤ بیروباوەڕی ئایینیی لە مێشکیدا دروست بووە و بەرەبەرە گەشەی کردووە، مرۆڤی چەرمەوو مردووەکانی خۆی لەژێر تەختی ژوورەکانیاندا ناشتووە کە ئەوە دەگەیەنێت ئایین گەیشتبێتە پلەیەکی زۆر بەرز لە گوندی چەرموودا.

بەڵام لە هەمووی گرنگتر دۆزینەوەی ئەو پەیکەرە بچووکانەیە لەو ناوچە نێوبراوانەدا کە بەخوداوەندی دایک یاخود خوداوەندی (پیت و بەرەکەت) ناسراون، کە بەسەرەتایەکی بەرجەستەکردنی خوداوەند و بیروباوەڕە ئایینییەکان دادەنرێت لەو پەیکەرە بچکۆلانەدا. دۆزینەوەی هەمان ئەم پەیکەرانە و بەهەمان شێوە لە ناوچەکانی وڵاتی سۆمەردا، گەورەترین پەیوەندیی گیانی و ئایینی دەردەخات لەنێوان شانەدەرییەکان و سۆمەرییەکاندا.

سۆمەرییەکان بەم پەیکەرە بچووکانەیان گوتووە (نەنخورسانگا) واتە خوداوەندی دایک[٢٢] کە بەژمارەیەکی زۆر لە ناوچە سۆمەرییەکاندا دۆزراوەتەوە. هەروەها ئەوەی زێتر پەیوەندیی سۆمەرییەکان بەکوردستانەوە پتەوتر دەکات واتای زاراوەی (نەنخورساگ)ە کە سۆمەرییەکان بەخوداوەندی دایکیان گوتووە، ئەم نەنخورساگە واتای (سەروەری چیا)ش دەگەیەنێت[٢٣]. بێگومان کۆنترینی ئەم پەیکەرە بچکۆلانە (خوداوەندی دایک) لە چەرموودا دۆزراوەتەوە و ئەگەر سۆمەرییەکان کاتی خۆی نیشتەجێی ئەم ناوچانە نەبووبێتن، چۆن نێوی (سەروەری چیا)یان لەو پەیکەرە بچووکانە دەنا لە کاتێکدا کە لە ناوچەی دەشتی لیتەیی تەختدا بوون.

گۆڵا (GULA) خوداوەندێکی تری سۆمەرییەکان بووە، کە خوداوەندی (تەندروستی) بووە لەلای سۆمەرییەکان و هەمیشە سەگێک یاوەری ئەم خوداوەندە بوو یاخود هێمای بووە[٢٤]، بوونی زاراوەی (گۆڵ) بەواتای سەگی نێر لە زمانی کوردیی ئەمڕۆدا نزیکیی نێوان گۆڵای سۆمەری و گۆڵی کوردیمان بۆ دەردەخات، کە ئەوە دەسەلمێنێت کە هەر لە کۆنەوە سەگ

هێمای خوداوەندێک بوو بێت و لە ناوچە چیاییەکانی کوردستاندا پەرسترا بێت. بێجگە لەم خوداوەندی دایکانە و خوداوەندی گۆڵا، هەندێکی تر لە خوداوەندەکانی تریش یەکەمین نیشتمانیان کوردستانی کۆن بووە بۆ نموونە خوداوەندی خۆر، کە سۆمەرییەکان پێیان گوتووە (ئۆتۆ) کە هەروەکو لەمەوبەر باس کرا یەکەمین نیشتمانی ئەم خوداوەندە کوردستان بووە لەبەر ساردی و بەفر و بارانی ناوچەکە.

تەنانەت هۆی هەڵبژاردنی ئەشکەوتی بەنێوبانگی (شانەدەر) لەلایەن مرۆڤی کۆنەوە، بۆ ئەوەی بەبەردەوامی تێیدا نیشتەجێ ببن ئەوە بووە کە ئەم ئەشکەوتە دەروازەکەی کەوتووەتە باشوورەوە و تیشکی خۆر و رووناکی بەدرێژایی چەندین کاژێر لە رۆژێکدا لەو ئەشکەوتەی داوە بەتایبەتی لە وەرزی زستاندا، ئەمە لەو هۆکارە سەرەکییانەیە کە ئەم ئەشکەوتەی کردووەتە باشترین دالدە بۆ مرۆڤی چاخە بەردینە کۆنەکان کە لە سەرمای زستاندا خۆیانیان تێدا پاراستووە بەتایبەتی لە چاخە بەستەڵەکییەکاندا[٢٥]. دوور نییە بۆ یەکەم جار پەرستنی خۆر وەک خوداوەندێک لە ئەشکەوتی شانەدەرەوە دەستی پێ کردبێت.

هەروەها وشەی (ئۆتۆ) زۆر لە وشەی (هەتاو)ی کوردییەوە نزیکە[٢٦].

ئەوەی زێتر چیایی ئەم خوداوەندە دەسەلمێنێت بیروباوەڕی سۆمەرییەکان خۆیان بووە کە گوتوویانە خوداوەندی خۆر لە شەودا نوقمی دەریاکان دەبێت و بەیانیانیش لەنێوان چیاکانەوە هەڵدێت.

بوونی ئەو زاراوانەی کە واتای خۆر دەگەیەنیت لە زمانی کوردیی کۆن و نوێدا کوردستانیی خوداوەندی خۆرمان بۆ دەسەلمێنێت بۆ نموونە (هەتاو، رۆژ، خۆر، هۆر، هۆڤار،...) و چەندانی تریش. زۆریی ئەو زاراوانە لە زمانە کۆن و نوێیەکانی کوردیدا بەڵگەیەکی تەواون بۆ ئەو دۆزە، هەروەکو چۆن لە زمانی عەرەبیدا نزیکەی (100) زاراوە هەیە کە واتای (وشتر) دەگەیەنێت و ئەسکیمۆکانیش دەیان وشەیان تەنها بۆ (بەفر) هەیە[٢٧].

مەزنترین خوداوەند لە خوداوەندەکانی سۆمەرییەکان، خوداوەندی (ئانۆ) یاخود (ئان) بووە کە خوداوەندی ئاسمان بووە و لەنێو سۆمەرییەکاندا





بەخوداوەندی خوداوەندەکان ناسراوە. لەنێوی ئەم خوداوەندەوە (ئانۆ) یاخود (ئان) تێبینیی نزیکیی نێوی ئەم خوداوەندە لە وشەی (ئاسمان)ی کوردییەوە دەکەین، کە زۆر پێ دەچێت لە بنەڕەتدا یەک وشە بوو بێتن، هاوواتایی ئەم دوو وشەیە زێتر راستیی ئەم بۆچوونە دەسەلمێنێت.

هەروەها هەر ئەم وشەی (ئان)ەیە کە لە سۆمەریدا بەشێوەی (ئینانا- ئینینی) دێت و بەواتای ئەستێرەی ڤینۆس، کە لە کوردیدا بووەتە (ناهید) و واتای هەمان ئەستێرە دەدات و بۆ نێوی کچانەش بەکاردێت[٢٨].

ئەو بیروباوەڕە سۆمەرییانەی کە دیاردە سروشتییەکانیان لە لا پیرۆز بووە لە هەزارەی چوارەمی پ.ز دا، سەرەتاکانی لە بەشە باکوورییەکانەوە دەرکەوتووە (چیاکانی زاگرۆس) بەتایبەتی لەو ناوچانەی کە باران بارینی تێدا بەخوڕ بووە، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو کەسانەی بنەما فەلسەفییەکانی ئەم ئایینە نوێیەیان بۆ یەکەم جار داڕشتووە لە ناوچەیەکدا دەژیان کە سروشتی لە سروشتی بەشە باشوورییەکانی عێراقی ئێستا نەچووە. (واتە کاتی خۆی لە ناوچەکانی کوردستاندا ژیاون) و خوداوەند ئەنلیلیش نازناوی (چیای مەزن)ی هەبووە، ئەم نازناوە ئەوەمان لا دڵنیا دەکات کە پیرۆزی و مەزنێتی ئەم خوداوەندە لەو کاتەوە بووە کە ناوچەکانی باشووری کوردستان هێشتا هەر خۆیان نوێنەری نێوەندی شارستانێتی بوو بێتن[٢٩].

هەروەها ئەوەی زێتر پەیوەندیی خوداوەند (ئەنلیل) خوداوەندی (با) بەچیاکانەوە پتەوتر دەکات، ئەوەیە کە کشتوکاڵ لە ناوچەکانی زاگرۆسدا بەهۆی بارانەوە بووە، بێگومان (با)ش رۆڵێکی کاریگەری لە جووڵاندنی هەور و باران بارینا هەیە. بەڵام کشتوکاڵی دەشتی لیتەیی پشتی بەئاوی رووبارەکان بەستووە و پەیوەندییەکی ئەوتۆی بە(با)وە نەبووە، بەڵام لەم ناوچانەدا هەروەکو غەریزەیەک و دابونەریتێکی باب و باپیران خوداوەندی (با) ئەنلیلیان هەر پەرستووە و لەلایان زۆر مەزن و پیرۆز بووە.

### بەڵگەی پێنجەم: پەرستگای زەکوورە

زەکوورە (ZIQURATU) هەرچەندە مەزنترین پەرستگا و بڕبڕەی پشتی ئایینی سۆمەرییەکانە و، دەچێتە نێو باسی ئایینی سۆمەرییەکانەوە بەڵام لەبەرئەوەی باسێکی زۆر گرنگە و پەیوەندییەکی زۆر بەهێزی بەچیاکانی کوردستانەوە هەیە هەر بۆیە بەشێوەیەکی سەربەخۆ لەسەری دەدوێم.

پەرستگای بەرز یاخود بورگ لە بابلیدا پێی گوتراوە (زیکوڕتۆ) کە واتای بەرز و بڵندیی گەیاندووە[٣٠]. زەکوورە هەرلە هەزارەی چوارەمی پ.ز وە لەنێو سۆمەرییەکاندا باوی بووە، واتە لەو سەردەمەدا کە سۆمەرییەکان بەتەواوەتی نیشتەجێی دەشتی لیتەیی بوون و تێیدا



26 وێنەیەکی خەیاڵیی زەکوورەی ئور







27 تەختەگڵێکی قوتابخانە کە قوتابییە سۆمەرییەکان لە 2500ی پ.ز لەسەری خوێندوویانە

بڵاوبوونەتەوە، ئەم زەکوورانە بەشێوەیەکی ئەندازەیی زۆر ڕێکوپێک دروست کراون و بەرزیی هەندێکیان (60) مەتر بووە و هەندێکی تریشیان زێتر بووە. لە زۆربەی شارە سۆمەرییەکاندا زەکوورە هەبووە کە هەریەکەیان پەرستگای جۆرە خوداوەندێک بووە.

ئەو لیستەیەی کە لە زەکوورە کۆنەکان دەدوێت و لە کتێبخانەکەی ئاشوور بانیپاڵدا دۆزراوەتەوە، ئاماژەی ئەوە دەکات کە 33 بورگی زەکوورە لە ناوچەکەدا هەبووە لە 27 شاری جیاوازدا. بەراوردکردنی نێوان ئەم دوو

ژمارەیە ئەوە دەگەیەنێت کە لەوانەیە لە یەک شاردا زێتر لە زەکوورەیەکی تێدا بووبێت[٣١].

لەو زەکوورە بەنێوبانگانەی کە تاوەکو ئەمڕۆ بەپێوە مابێت زەکوورەی (ئور)ە کە لە سێ نهۆم پێکهاتووە و رووبەری تەختەکەی (60 بە 45) مەترە، بەڵام بەرزایی ئێستای ئەم زەکوورەیە نزیکەی 20 مەترە هەرچەندە لە نهۆمی یەکەم و بەشێکی دووەمی زێتر، بەشەکانی دیکەی نەماون. زەکوورەی ئور سێ پلیکانەی لە رووی باکووری رۆژهەڵاتدا هەیە کە یەکێکیان لە نێوەڕاستدایە و دووانەکەی تریشیان کەوتوونەتە لایەکانییەوە[٣٢].

زەکوورە شوێنێکی زۆر پیرۆز بووە لەلایەن سۆمەرییەکانەوە لەبەرئەوەی پەیکەری بەنێوبانگترین خوداوەندەکانیانی تێدا بووە، ئەمە جگە لەوەی کە جێ نزرگەی زەیوانی مەزنیش بووە کە بەنوێنەر یاخود یاوەری خوداوەندی خوداوەندان ناسراوە و شوێنی نزا و پاڕانەوە و تەنانەت حەجکردنی کۆمەڵانی خەڵکی سۆمەر بووە و تیایدا قوربانییەکانی خۆیانیان پێشکەشی خوداوەندان کردووە، هەروەها ئەم زەکووڕانە بەیەکەمین قوتابخانە و فێرگەی مێژوو دادەنرێت کە تێیدا سۆمەرییەکان وانە ئایینی و کەهنوتییەکانیان تێدا خوێندووە. ئەم زەکووڕانە لە سێ نهۆم یاخود لە هەفت نهۆم پێکهاتووە کە هەر نهۆمەی کارێکی تایبەتیی بۆ تەرخان کراوە، بۆ نموونە یەکێک لەو نهۆمانە جێگای سەربڕین و پێشکەشکردنی قوربانییەکان بووە بۆ خوداوەندان.

مرۆڤی کۆن، بەتایبەتی مرۆڤی چیاکانی کوردستان هەر لە چاخە کۆنەکانەوە هێندێک لە دیاردە سروشتییەکانی پەرستووە بەتایبەتی خۆر و مانگ و هەروەها ئاسمانیش کە ئەمانەی لە باوەش گرتووە، شانەدەرییە کۆنەکان لەسەر لووتکەی بەرزترین چیاکانیانەوە ئەم ئەستێرانەیان پەرستووە، چونکە لەو بڕوایەدا بوون کە زێتر لێیان نزیک دەبنەوە و قوربانییەکانیشیان بۆ ئەم خوداوەندانە واتە خۆر و مانگ و ئەوانی تر، هەر لەسەر لووتکەی ئەم چیایانە بووە.





پەرستگاکانی عێراقی کۆن رەسەنی هەموویان دەچێتە سەر بەشی باشووری کوردستان هەرچەندە هێندێک جوداوازییان لە نەخشە و شتی تردا هەیە[٣٣]، کە ئەمیش بەهۆی تێپەڕبوونی کات و پێشکەوتنی زێتری شارستانی و بیروباوەڕە ئایینییەکان شتێکی سەیر نییە.

زەکوورە لە هەموو پەرستگاکانی تر زۆرتر پەیوەندیی بەکوردستانەوە هەیە، چونکە هەروەک وترا لە ناوچە شاخاوییەکاندا لەسەر لووتکەی چیاکانەوە شانەدەرییەکان خوداوەندەکانیان پەرستووە، لەپاش کۆچکردنی ئەم شانەدەرییانە بۆ ناوچەکانی دەشتی لیتەیی و نەبوونی چیا و گرد و هەر شوێنێکی بەرزی تر لە ناوچەکەدا وای لەو سۆمەرییانە کردووە کە زەکوورە دروست بکەن و بیکەنە ئەڵتەرناتیڤی چیایەک کە بابوباپیریان خووی پەرستنی خوداوەندانیان لەسەر لووتکەکانیان پێوەگرتووە.

تەواوی زانایانی ئارکیۆلۆژی و ئەو مێژوونووسانەی کە لە کۆنەوانیدا پسپۆڕن بەدڵنیاییەوە، لەو باوەڕەدان کە زەکوورە جێگرێکە بۆ ئەو چیایانەی کە بابوباپیرانی سۆمەری دابە ئایینییەکانیان لەسەر ئەنجام داوە.

زەکوورە وەک بورگێکی مەزن لە نێو شارە سۆمەرییەکاندا دیار بووە، ئەوەی زێتر رەسەنی ئەم زەکووڕانە بۆ چیاکانی کوردستان دەگەڕێنێتەوە نەخشەی بەنێوبانگی زەکوورەی سۆمەرییەکانە کە ئەویش زەکوورەی (ئور)ە، ئەم زەکوورەی ئورە بەتەواوەتی و وا دروست کراوە کە رووی لە چیاکانی کوردستان و بەتایبەتی یەکەمین نیشتمانی شانەدەرییەکان بێت، کە هەروەکو لە پێشەوە باس کرا، ئەم زەکوورەیە پێشەکەی ئاڕاستەی باکووری رۆژهەڵات کراوە، کە بەتەواوەتی ناوچەکانی شانەدەر و هەزارمێرد و زەرزی و جۆگەمامی و چەرموو و دەیان و سەدانی ئەو ناوچانەیە کە هەر لە نیو ملیۆن ساڵەوە مرۆڤی کۆنی تێدا ژیاوە. ئاڕاستەی ئەم زەکوورەیە بۆ ناوچە کۆنەکانی کوردستان مزگەوتی موسڵمانانمان وەبیر دەخاتەوە کە هەموویان بەرەو رووگە (قبلة) لە مەککەدا ئاڕاستە کراون.

دیارە ئاڕاستەکردنی زەکوورەی (ئور) کە بەنێوبانگترین زەکوورەی سۆمەرییانە شتێکی رێکەوت نەبووە و هەڵبەتە لە چیاکانی کوردستاندا و

لەو سەردەمەدا شوێنێکی وا پیرۆز هەبووە کە وەک مەککە شایانی ئەوە بووبێت رووی زەکوورەکانی تێ بکەن. جا ئایا ئەو شوێنە پیرۆزە پەرستگایەکی کۆنی زۆر پیرۆزی باپیرانی سۆمەرییەکان بووبێت، یان هەر پیرۆزیی ئەو چیایانە بووە کە یەکەمین نیشتمانیان بووە و پاش کۆچکردنیشیان بۆ ناوچەی دەشتی لیتەیی هەر لەبیریان نەچووەتەوە.

بەڵگەیەکی تریش کە زێتر رەسەنی زەکوورەی سۆمەری بۆ کوردستان دەباتەوە، ئەوەیە، کە هەروەکو هەموومان دەزانین کە کاشییەکان نەتەوەیەک بوون لە هەزارەی سێیەم و دووەمی پ.زدا لە کوردستاندا ژیاون، ئەم



28 زەکوورەی شار (دور کوری گالزۆ) کە لەلایەن کاشییەکانەوە دروست کراوە





کاشییانە پاش ئەوەی کە ناوچەکانی دەشتی لیتەییان گرت و بۆ ماوەی چوار سەدە فەرمانڕەوابوون تێیدا (1595-1162) پ.ز[٣٤]. لە ماوەی ئەو چوارسەد ساڵەدا هەندێک پەرستگا و زەکوورەیان دروست کردووە، کە شێوە ئەندازەییەکانیان تابلێی رێکوپێکە و زۆر لە زەکوورەکانی تر پێشکەوتووتر بوون. ئەوە دەگەیەنێت کە پەیوەندیی نێوان زەکوورە و چیاکانی کوردستان زۆر نزیک بووە. زەکوورە بەنێوبانگەکەی شاری (دور کوری گالزۆ) پایتەختی کاشییەکان و (عقرقوف)ی ئێستا، کە هەر بەپێوە ماوە، زێتر پەیوەندیی زەکوورە بەچیاکانی کوردستانەوە پتەوتر دەکات.



29 وێنەیەکی خەیاڵیی باخچە هەڵواسراوەکانی بابل

ئەوەی راستی بێت باخچە هەڵواسراوەکانی بابلیش کەوتۆتە باکوری خۆرهەڵاتی کۆشکی پادشاییەوە، بەیەکێک لە هەفتەمین سەرسوڕهێنەرەکانی جیهان دادەنرێت کە (نابو خودنوسور) بۆ خێزانە مادییەکەی دروست کردووە کە نێوی (ئەمیتس) بووە، شوێنکەوتەی ئەم باخچەیە بەرەو رووی باکووری رۆژهەڵات، ئەوە دەگەیەنێت کە هەمیشە بەرامبەری نیشتمانی مادەکان بێت و شازادە (ئەمیتس) لە شاری بابلدا تێیدا بحەوێتەوە و هەست بەنامۆیی نەکات(٣٥).

ئەوەی شایانی باس بێت هەتاوەکو سەردەمەکانی دواییش هەندێک لە شاخەکانی کوردستان وەکو شوێنێکی پیرۆز و بۆ جێگای پەرستن بەکارهێنراون، بۆ نموونە گۆڕی زۆربەی پیاوچاکان و بەتایبەتی پیاوە زەردەشتییەکان لەسەر لوتکەی ئەو چیایانەدا هەن، هەروەکو پیرەمەگروون و پیر ئەلیاس و پیر داود لە ناوچەکانی سلێمانی و چەندان گۆڕی تریش لە ناوچەکانی کوردستاندا بەتایبەتی چیا سەختەکانی هەورامان. هەروەها لە تێڕوانینی زۆربەی مێژوونووسانیشدا زەکووڕە جێگای سەرسام بوونی عەرەبەکان و گەلانی موسڵمانی تریش بووە و منارە بەنێوبانگەکەی سامەڕا (مەلوییە) رەنگدانەوەیەکی زۆر بەرچاو و دیارە بۆ زەکووڕە کۆنەکان(٣٦).

کەواتە دروستکردنی زەکووڕە وەک شوێنێکی بەرز بۆ پەرستنی خوداوەندان هەر بەیادی چیاکانی کوردستانەوە بووە.

چیرۆکی لافاوە بەنێوبانگەکە، کە هەروەک لە دواییدا دێمە سەری باسی چیاکانی کوردستان دەکات کە کەشتییەکەی (نوح – ئۆتۆناپشتم) لەسەر یەکێک لە چیاکانیدا گیرساوەتەوە کە لەوانەیە ئاراستەکردنی هەندێک لە زەکووڕە کۆنەکانی سۆمەر بۆ ناوچەکانی ئەم چیایانە پەیوەندیی بەچیرۆکی لافاوەکە و لەنگەرگرتنی کەشتییەکەوە لەسەر چیایەکی کوردستاندا هەبێت.

بەشێکی گرنگی زەکووڕە کە حەرەم بووە و بەسۆمەری پێی گوتراوە (ئەی کوڕ – E - KUR) واتای (چیای پەرستگا) دەگەیەنێت، لە راستیدا جگە





لە شێوە ئەندازەییەکەی زەکووڕە کە هەر بەچیا دەچێت، ئەو بەشەی زەکووڕە کە بەئەی کوڕ یاخود چیای پەرستگا نێوبراوە گەورەترین بەڵگەیە کە رەسەنی زەکووڕە دەباتەوە سەر چیاکانی کوردستان(٣٧).

تەنانەت واتای خودی (زەکووڕە)ش گردی ئاسمان یاخود چیای خوداوەند دەگەیەنێت کە زێتر راستیی ئەو بۆچوونانەی سەرەوە دەسەلمێنێت(٣٨). دیسانەوە هەر وشەی زەکووڕە واتای لووتکەی چیاش دەگەیەنێت(٣٩).

بەڵگەیەکی تر بۆ چیایی بوونی زەکووڕە نەخش و نیگارەکانی ئاشوور بانیپاڵە کە دەربارەی زەکووڕەی (سوسە)ی ناوچەی ئیلامە، ئەم نەخش و نیگارانە وادەگەیەنن کە زەکووڕەی سوسە کاتی خۆی چەندین شاخی (قۆچ) لە برۆنزی پیاکێشراوی بەسەرەوە بووە(٤٠). بوونی ئەم شاخانە لەسەر زەکووڕەی سوسە ئەوە دەگەیەنێت کە یەکەمین نیشتمانی زەکووڕە شاخەکان بووە، چونکە لەسەر شاخەکان مرۆ چەندەها ئاژەڵی وەک بەراز و بزن و بەرانە کێویی شاخدار بەدی دەکات، جا بۆ ئەوەی کە ئەم زەکووڕانە وەکو چیایەک بێنە پێش چاوی خەڵکی ئەو سەردەمە هاتوون بەو شاخانە رازاندوویانەتەوە.

دەربارەی نێوی زەکووڕەکان هەروەکو چۆن ئەمڕۆ هەر چیایەک و بگرە زۆربەی لووتکەکان ناوێکی تایبەتی خۆیان هەیە، زەکووڕەکانیش لەو سەردەمەدا هەریەک نێوێکی خۆیانیان هەبووە بۆ نموونە زەکووڕەی (ئاشوور) پێی گوتراوە (خانووی چیای گەردوون) و زەکووڕەی ئوریش بە(خانووی زەبابا و ئینینای بڵند کە لووتکەکانی لە ئاسماندایە) بەنێوبانگ بووە. هەروەها بەزەکووڕەی (کیش)یشیان گوتووە (خانووی چیا). ئەم نێوانە زێتر رەسەنی زەکووڕە بۆ چیاکان دەگێڕێتەوە.

بەنێوبانگترین ئەو تیۆرییانەی کە زانا ئارکیۆلۆژییەکان بۆ روونکردنەوەی زەکووڕە و هۆی دروستکردنی دایان نابێت، تیۆری (لیثابی و ئەندازیاری بیناسازی دۆمبارت)ە ئەمانە دەڵێن، زەکووڕە کاتی خۆی (تەخت)ی خوداوەند بووە، خوداوەند حەزی بەنیشتەنیی لووتکەی چیاکان بووە. بەو شێوەیە زەکووڕە وەک چیایەکە کە خوداوەند لەسەر تەختەکەی

دادەنیشێ و فەرمانڕەوایی گەردوون دەکات[٤١]. ئەم تیۆرەش وەک هەموو ئەو بەڵگانەی تر کە باس کران گەواهی بۆ چیایی بوونی پەرستگای زەکووڕە دەدات.

**بەڵگەی شەشەم: ئەفسانە سۆمەرییەکان**

ئەفسانە (MYTHOS) ئەو ڕووداوانە باس دەکات کە لە سەردەمێکی زۆر کۆندا ڕوویان داوە، ئەو دیاردە کەونی و لە توانا بەدەرانە شی دەکاتەوە و هۆی پەیدابوونیان ڕوون دەکاتەوە[٤٢]. یاخود بەشێوەیەکی گشتی بریتییە لەو چیرۆکانەی کە کاتی خۆی زۆربەی گەلانی مرۆڤایەتی دەیانگێڕایەوە لە هەندێک موناسەبەتدا و لەو بڕوایەدا بوون کە چیرۆکێکی ڕاستەقینەیە و ئەو ڕووداوانە دەگێڕێتەوە کە بەڕاستی لە ڕابردوودا ڕوویانداوە[٤٣].

پێشکەوتنی زانستی میسۆلۆژیا (ئەفسانەزانی) بووە هۆی ئەوەی کە بەچاوێکی دی تەماشای ئەفسانە بکرێت و لە ریزی چیرۆکە خوڕافییەکانی بکاتە دەرەوە، ئەمڕۆ زانایانی میسۆلۆژی و ئارکیۆلۆژی لەپاش چەندەها لێکۆڵینەوە لەسەر ئەو ئەفسانانە و بەتایبەتی ئەفسانە خۆرهەڵاتییەکان، وای بۆ دەچن کە ئەم ئەفسانانە کاتی خۆی ڕووداوی ڕاستینە بێت و لە ئەنجامی تێپەڕبوونی کات و دەماودەم کردنی ئەم چیرۆکانەوە بەرگی ئەفسانە و خوڕافیاتی بەبەردا کرابێت، هەر ئەفسانەیەک ئێمە بیگرین و بچینە بنجوبنەوانییەوە چیرۆکێکی مێژوویی ڕاستینەمان بۆ دەگێڕێتەوە، هەر بەهۆی ئەفسانە یۆنانییەکانی ئەلیادەوە بوو شوێنی شاری (تەڕوادە)ی مێژوویی دۆزرایەوە.

بۆ نموونە چیرۆکی لافاوەکە کە پاشان باسی لێوە دەکەم، لەمەوبەر لەلایەن زۆر کەسەوە بەشتێکی خوڕافی دادەنرا، بەڵام پاش لێکۆڵینەوە بەنێوبانگەکەی زانای ڕووسی (ئەلیکساندەر گەڕبۆڤسکی) لە کتێبەکەیدا (نهێنی کۆنترین مێژوو) بۆمان دەردەکەوێت کە چیرۆکی ئەو لافاوە ئەفسانە و خوڕافیات نییە و بەڕاستی ڕووی داوە، تەنانەت لێکۆڵینەوە جیۆلۆجی و ئارکیۆلۆژییەکانی دەشتی لیتەییش، ڕاستیی ڕوودانی ئەم





لافاوە دەسەلمێنن.

مرۆڤی کۆن لە هەموو نەتەوەکانی پاش خۆیان زێتر خاوەنی ئەفسانە بوون و بەشێکی گرنگی ژیان و ئایینیان بووە، تەنانەت هێندێک ئەفسانە کە ئەمڕۆ لەنێو کوردەواریی خۆماندا باوە ڕەگوڕیشەیان دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمانێکی زۆر کۆن کە هیچ دوور نییە هەندێکیان بچنەوە سەردەمی سۆمەرییەکان و بگرە لەوانیش کۆنتر، ئەفسانەی خدری زیندە کە لە کوردەواریدا باوە، بەنێوێکی تر و بەهەمان شێوە لە تەختە گڵەکانی سۆمەردا بەرچاومان دەکەوێت.

ئەفسانەی سۆمەرییەکان بەهۆی داهێنانی نووسینی مێخییەوە و تۆمارکردنیان، لە هەموو نەتەوەکانی تر زێتر بەدەستمان گەیشتووە. زۆربەی ئەفسانە سامییەکانی سەردەمی ئەکەدییەکان و بابلییەکان و ئاشوورییەکان دەچنەوە سەردەمی سۆمەرییەکان و گەلانی دوای سۆمەرییەکان پەرچڤەی زمانەکانی خۆیانیان کردووە، تەنانەت پەیوەندییەکی زۆر بەهێز لەنێوان تەورات و ئەفسانەی سۆمەرییەکاندا هەیە و هەرچی چیرۆکی نێو ئەو کتێبە پیرۆزانە هەیە لەسەر تەختە گڵەکانی سۆمەردا بەرچاومان دەکەوێت، لەوانە کەشتییەکەی نوح و چیرۆکی قابیل و هابیل و شێوەی لە دایکبوونی مووسا پێغەمبەر و زۆری تر.

لە ئەفسانە بەنێوبانگەکانی سۆمەری، ئەفسانەی ئادابا و دابەزینی خوداوەند ئەشتار بۆ جیهانی ژێروو و چیرۆکی دروستبوونی گەردوون و گلگامش و لافاوەکە و سەدان ئەفسانەی تر کە هەریەکەیان کەم و زۆر باسی چیاکانی کوردستانیان کردووە.

یەکێک لە ئەفسانە سۆمەرییەکان ئەوەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە (چۆن خودی سۆمەرییەکان ئەوەیان لەبیر ماوە کە دانەوێڵەی گەنم و جۆ بۆ یەکەم جار لە ناوچەیەکی شاخاویی نزیک وڵاتی بابلەوە هێنراوە)، هەروەها ئەفسانەیەکی سۆمەریی تر کە لە سەدەی هەژدەمی پ.ز وە نووسراوەتەوە، بۆمان دەگێڕێتەوە کە (چۆن خوداوەند ئانۆ – ANU خوداوەندی ئاسمان گەنم و جۆی لە ئاسمانەوە بۆ زەویی بەپیت هێناوە و ئەنلیلیش – ENLIL

خوداوەندی هێزی پادشایەتی، هەڵساوە بەکۆکردنەوەیان و لە وڵاتی چیاکاندا دایناوە و چیاکانی داخستووە هەروەکو چۆن دەرگایەک دادەخرێت، پاشان نین ئازو – NINAZU و نین مادا – NINMADA بڕیاریان دا کە ڕێ بەوڵاتی سۆمەر بدەن ئەو وڵاتەی دانەوێڵە ناناسێت، دانەوێڵە بناسن)[٤٤]. ئەم دوو ئەفسانە سۆمەرییە کە هەردووکیان باسی نیشتمانی یەکەمینی گەنم و جۆ و دانەوێڵەکانی تر دەکەن، بەتەواوەتی کوردستانی بوونی سۆمەرییەکان دەسەلمێنێت.

لە ئەفسانەی یەکەمدا کە باسی ئەوە دەکات کە چۆن سۆمەرییەکان لە بیریان ماوە بۆ یەکەم جار گەنم و جۆ لە ناوچەیەکی شاخاویی نزیک وڵاتی بابلەوە هێنراوە، ئەوە دەسەلمێنێت کە سۆمەرییەکان خۆیان هەر لەو ناوچە شاخاوییانەوە هاتبێتنە دەشتی لیتەیییەوە، ئەگەر وانەبێت چۆن لە بیریان دەمێنێت کە بۆ یەکەم جار گەنم و جۆ لە ناوچەیەکی شاخاویی نزیک وڵاتی بابلەوە هێنراوە، دیارە نزیکترین ناوچەی شاخاویش بۆ وڵاتی بابل هەر چیاکانی زاگرۆسی کوردستانە کە کۆنترین گەنم و دانەوێڵەی بەبەردبووی (المتحجر) تێدا دۆزرابێتەوە.

دۆزینەوەی گەنم و جۆی بەبەردبوو لە گوندەکانی زاوی چەمی و چەرموودا کە مێژوویان دەگەڕێتەوە بۆ پێش نیشتەجێ بوونی سۆمەرییەکان لە دەشتی لیتەییدا ڕاستیی ئەم ئەفسانە سۆمەرییە دەسەلمێنێت، ئەوەی شایانی باس بێت کوردستان کۆنترین ناوچەی جیهانە کە دانەوێڵەی لێ ڕوابێت و لەوێوە بۆ وڵاتی سۆمەر و ناوچەکانی تری جیهان بڵاوبووەتەوە، ئەم ڕاستییە لێکۆڵینەوە ئارکیۆلۆژییەکان سەلماندوویانە.

لە ئەفسانەی دووەمیشدا باسی دروستبوونی دانەوێڵە دەکات کە بۆ یەکەم جار بەشێوەیەکی خۆڕسک بووە و بەباران ڕواوە، بارانیش لە ئاسمانەوە دێتە خوارەوە، هەر بۆیە سۆمەرییەکان لەو ئەفسانەیەدا گوتوویانە کە ئانۆ خوداوەندی ئاسمان گەنم و جۆی لە ئاسمانەوە بۆ زەویی بەپیت هێناوە، هەروەها هەر لەم ئەفسانەیەوە بۆمان دەردەکەوێت کە خەڵکی ناوچەی لیتەیی لە پێش چیاییەکانی کوردستاندا دانەوێڵە و





کشتوکاڵیان نەزانیوە، بەڵکو دوای کۆچکردنی سۆمەرییەکان بۆ ئەم ناوچانە و لەپاش بڕیاردانی (نین ئازۆ و نین مادا) کە دوو پەرستراوی سۆمەرییەکان بوون، سۆمەرییەکان دانەوێڵەیان ناسیوە. من لەو بڕوایەدام کە نین ئازۆ و نین مادا خوداوەند نەبوون و دوو کەسی ئاسایی بوون و ئەم دووانە لە چیاکانی کوردستانەوە بۆ دەشتی لیتەیی کۆچیان کردووە و تۆوی گەنم و جۆ و دانەوێڵەی تریان لەگەڵ خۆیاندا بردووە و لەوێ ڕواندوویانە پاشان کە سۆمەرییەکان دانەوێڵەیان ناسیوە و فێری کشتوکاڵ بوون بەهۆی ئەو دوو کەسەوە، لە پاش ماوەیەک پەرستوویانن و نێویان لەنێو ئەم ئەفسانەیەدا –نەمر – کردوون، بەڵام نین ئازۆ و نین مادا نەگەیشتوونەتە پلەی خوداوەندێتی.

زۆربەی ئەو نێوە پیرۆزانەی کە لە ئەفسانە سۆمەرییەکاندا هاتوون، کاتی خۆی هەریەکەیان داهێنانێکیان هەبووە و شتێکیان دروست کردووە یاخود شتێکیان هێناوە کە لە وڵاتی سۆمەردا نەبووە و سوودی بەکۆمەڵانی خەڵکی سۆمەری گەیاندووە. ئەمانە پاش مردنیشیان هەر لەنێو دڵی خەڵکی سۆمەردا بەهۆی داهێنانەکانیانەوە بەزیندوویی ماونەتەوە تا دەماودەم باس کراوە و گەیشتوونەتە ئەو ڕادەیەی کە بپەرسترێن و نێویان بچێتە دووتوێی ئەفسانە پیرۆزەکانی سۆمەرەوە. جگە لەو ئەفسانانەی سەرەوە چەندین ئەفسانە و چیرۆکی مێژوویی تر هەیە کە بۆ هەزارەی دووەمی پ.ز دەگەڕێنەوە کە بەزمانی سۆمەری نووسراون و پەیوەندیی نێوان سۆمەرییەکان و چیاکانی کوردستان زێتر پتەو دەکەن.

لەوانە ئەو دوو چیرۆکەی (ئەنمیر گیری) کە پادشای بنەماڵەی یەکەمی وەرکا بووە و کە پەیوەندی بەهەرێمی (ئارتا)وە هەبووە کە دەکەوێتە باکووری خۆرهەڵاتی کوردستانەوە. هەروەها چیرۆکێکی تریش هەیە دەربارەی ئەم پادشایە و یەکێک لە سەرکردەکانی کە نێوی (لۆگا پەندا)یە.

جگە لە گرنگیی مێژوویی ئەم چیرۆک و ئەفسانانە، چەندین زانیاریی بەکەڵکی دەربارەی سروشتی شاخاویی وڵاتی ئارتا و سیستمی فەرمانڕەوایانی تێدایە کە زۆر لە سیستمی فەرمانڕەوایی دەوڵەتەکانی

شارە سۆمەرییەکان دەچێت، پاشان لە کەرەستە ئابوورییە بنچینەییەکانی وەک زێڕ و لازوردی وڵاتی ئاڕتاش دەدوێت. لەو باسە زۆر گرنگانەی کە ئەم ئەفسانە مێژووییانە بۆمان دەگێڕنەوە، ئەوەیە کە هەندێک لە خوداوەندە سۆمەرییەکان لە هەرێمی (ئاڕتا)دا پەرستراون[٤٥]. نزیکیی سیستمی فەرمانڕەوایی و لەیەکچوونی هەندێک خوداوەندانی نێوان وڵاتی ئاڕتای کۆنی کوردستان و سۆمەرییەکان چەند بەڵگەیەکی بەهێزی ترن کە شاخاوی بوون و کوردستانی بوونی سۆمەرییەکان دەسەلمێنێت.

## بەڵگەی حەوتەم: چیرۆکی لافاوەکە

کێ هەبێت چیرۆکی لافاوەکە و نێوی نوح پێغەمبەر و کەشتییەکەی نەبیستبێت؟ چیرۆکی لافاوەکەی نوح جگە لەوەی کە تێکستێکی ئایینییە و لە کتێبەکانی وەک تەورات و قورئان و هی تردا هەیە، لە کوردەواریی خۆماندا کراوەتە چیرۆک و باوکان و دایکان هەر لە کۆنەوە بۆ منداڵانیان گێڕاوەتەوە.

ئەم لافاوە لەلای زۆر کەس بەئەفسانە و شتی پڕوپووچ دەدرایە قەڵەم، بەڵام پاش لێکۆڵینەوە مێژوویی و ئارکیۆلۆژی و جیۆلۆجییەکانی ناوچەکانی خۆرهەڵاتی نزیک، راستیی روودانی ئەم لافاوە لە ناوچەکانی میزۆپۆتامیا و دەوروبەریدا سەلمێنرا، هەچ مێژوونووسێک لە مێژووی ئەم ناوچانە کۆڵیبێتەوە، باسی لافاوەکە و کەشتییەکەی نوحی کردووە.

چیرۆکی ئەم لافاوە و لێکۆڵینەوە لە بوون یاخود نەبوونی ئەم لافاوە وای لێ هات کە زانایان کتێبی سەربەخۆی لەسەر بنووسن. هەرچەندە مێژووی روودانی ئەم لافاوە تاوەکو ئێستا بەتەواوەتی نەزانراوە، بەڵام ئەوە هەیە کە لافاوەکە لە سەردەمانێکی زوودا رووی داوە، تەورات و قورئان یەکەم سەرچاوە نین کە باسی لافاوەکەی نوحیان کردبێت، بەڵکو دەنگوباسی لافاوەکە و کەشتییەکەی نوح لەسەر تەختە گڵەکانی سۆمەرییەکانیشدا تۆمار کراوە. لافاوەکە رووداوێکە کە تێکستە سۆمەری و بابلییەکان بە سێ جۆری سەرەکی بۆمان دەگێڕنەوە، کە بەشێوەیەکی گشتی هەر سێکیان





لە یەک دەچن، یەکەمین تێکست دەربارەی ئەم لافاوە بەزمانی سۆمەری نووسراوەتەوە کە پاڵەوانەکەی تێیدا نێوی (زیۆسەدرا – ZIUSODRA) بووە لەجیاتی (نوح) و مرۆڤایەتی لە مەترسیی نەمان رزگار کردووە لەکاتی لافاوە مەزنەکەدا، کە تەواوی زەمینی گرتووەتەوە بەپێی بۆچوونی پێشینان تێکستی دووەم تەختە گڵی یازدەیەمە لە ئەفسانەی گلگامش کە پاڵەوانەکەی نێوی (ئۆتناپشتم – UTNAPISHTM) بووە و هەڵساوە بەدروستکردنی کەشتییەکی گەورە و تێیدا بەپێی توانا خەڵک و ئاژەڵان و مەل و ئازووخەی تێدا کۆکردووەتەوە. سێیەمین تێکست کە لە هەموویان درێژترە چیرۆکی (ئەتراهاسیس – ATRAHASIS)ە بەنێوی ئەو پاڵەوانەوە کە بەهەمان رۆڵی زیۆسەدرا و ئۆتناپشتم هەڵدەستێت[٤٦] لە ئیسحاحی حەوتەم و هەشتەمی تەوراتیشدا هەمان چیرۆکی لافاوەکە هاتووە بەڵام پاڵەوانەکەی ئەمجارە بەنێوی (نوح)ەوە بووە[٤٧].

لەبەرئەوەی سۆمەرییەکان یەکەم کەس بوون کە لەسەر تەختە گڵەکانیان چیرۆکی لافاوەکەیان تۆمار کردووە، کەواتە رزگارکەری مرۆڤایەتی و پاڵەوانی لافاوەکە بوون هەروەکو چۆن ناوەکەی سۆمەری بووە (زیۆسەدرا) رەگەزیشی هەر سۆمەری بووە، بەو پێیە زیۆسەدرا و هەموو ئەو خەڵکانەی کە لەگەڵیدا بوون سۆمەری بوون، کەشتییەکەی زیۆسەدرا هەروەکو لەلایەن زانایانی ئارکیۆلۆژییەوە بەدەرخراوە لەسەر یەکێک لە کێوەکانی کوردستانەوە لەنگەری گرتووە، هەندێک دەڵێن ئەم کێوە کێوی پیرەمەگروونی نزیک شاری سلێمانییە و هەندێکی تریش دەڵێن چیای حەسارۆستی ناوچەی هەولێرە و کۆمەڵێکی تریش دەڵێن کەشتییەکە لەسەر چیایەکی نزیک زاخۆوە لە کەناری چەپی رووباری دیجلەوە لەنگەری گرتووە[٤٨]، لە قورئاندا نێوی ئەم چیایە بەجوودی هاتووە، (وأستوت على الجودي) وشەی جوودی هەر هەمان وشەی (گۆتی)یە کە رەگەزێکی کۆنی کوردستانن و ئەوە دەگەیەنێت کە کەشتییەکە لە ناوچەکەی ئەواندا لەنگەری گرتبێت.

هەندێکی تر لە زانایان وای بۆ دەچوون کە کەشتییەکە لەسەر چیای

(ئاراڕات)ی باکووری کوردستاندا لەنگەری گرتبێت! و پاشماوەی ئەو دار و تەختە کۆنانەی کە لە لاپاڵی ئەو چیایەدا دۆزراوەتەوە، دەیانکردە بەڵگەیەکی ماددی بۆ پتەوکردنی راکەیان، بەڵام پاش ئەوەی کە چەند پارچەیەکی ئەو تەختە کۆنانەیان بەهۆی (ماددەی تیشکدەری کاربۆن 14)وە تاقی کردەوە، دەرکەوت کە مێژوویان دەگەڕێتەوە بۆ 600 ساڵی دوای زایین! کە ئەو مێژووە گەلێک نوێیە بۆ ڕوودانی ئەو لافاوە...؟[٤٩].

ئەلیکساندەر پۆلیهەستۆر ALEX. POLYHISTOR بەو شێوەیەی کە لە ئۆزابیۆسی ئەرمەنی باسی کردووە دەڵێت «کەشتییەکە و پاڵەوانە بابلییەکەی (کسیسوثروس) XISUTHROS لە ڕۆژی لافاوەکەدا لەسەر



30 پاشماوەی تەختە کۆنەکانی چیای ئاراڕات





چیاکانی کوردیای KORDUAE ئەرمینیا گیرساوەتەوە، هەروەها چیای نیسیر NISIR کە ئەم نێوە لە سەرەتادا واتای (ڕزگارکردن)ی دەگەیاند، ئاشوورییەکان و بابلییەکان بەسەر چیایەکی ناوچەی لۆلۆ LULUدا دایانبڕیوە کە بەزمانی نێوخۆیی لۆلۆکان، کنیبا KINIPA (KINIBA)ی پێ گوتراوە کە کەوتووەتە سەر ڕێڕەوی خوارووی زێ وە لە ناوچە هەرە باشوورەکانی وڵاتی KORDYAE کۆردیای»[٥٠].

هەندێک لە لێکۆڵەرەوان دەڵێن کەشتییەکە لەسەر چیای (نەسیر – NI-SIR) لەنگەری گرتووە، ئەم چیایە بەنێو (نەسیر چیای گۆتی) باس کراوە کە بۆ نەتەوەی گۆتییەکان دەگەڕێتەوە کە لەگەڵ لۆللۆبییەکاندا نیشتەجێی دەشتەکانی سلێمانی بوون.

هەروەها مێژوونووسی مەزنی کوردیش (مامۆستا محەمەد ئەمین زەکی) ئەم رایە وە خۆ دەگرێت و دەڵێت کەشتی (نوح) لەسەر چیای (نیسیر) چیای رزگاربوون لەنگەری گرتووە، کە بەزمانی نەتەوەی لۆللۆی کوردستانی پێی گوتراوە (کینیپا) کە دوور نییە چیای پیرەمەگروون بێت. دیسانەوە مامۆستا محەمەد ئەمین زەکی دەڵێت: کە ئاشوور ناسرپاڵ باسی



31 وێنەیەکی خەیاڵیی کەشتییەکەی نوح

چیای (نیسیر)ی کردووە و کە دەڵێت دەکەوێتە خۆرهەڵاتی وڵاتی ئاشوورەوە کە تاکە چیایە لووتکەی وەک سەری رمی هەبێت[٥١].

دەربارەی نێوی (کنیبا)ی گۆتی کە بەچیاکە گوتراوە تا ئێستاش دۆڵێک لەلای چەپی شاخی پیرەمەگرووندا هەیە کە دەکەوێتە بەردەمی باشووری سورداش و رۆخی شاخی (سپیلک) و بە(کونەبا) بەنێوبانگە. ئەوی راستیی بێت وشەی (کنیبا)ی گۆتی و (کونەبا)ی کوردیی ئێستا زۆر لە یەکترەوە نزیکن، کە وامان لێ دەکات بڵێین: بەدڵنیاییەوە کەشتییەکە لەسەر پیرەمەگروون لەنگەری گرتووە، هەروەها نزیکیی پیرەمەگروون و دۆڵی کونەباش لەیەکەوە هەریەک کیلۆمەتر دەبن زێتر ئەوە دەسەلمێنێت ئەم دۆڵی کونەبایەش نزیکی زێی بچووکە.

هەرچۆنێک بێت پیرەمەگروون بێت یاخود هەر چیایەکی تر گرنگ ئەوەیە کەشتییەکە لەسەر یەکێک لە چیاکانی کوردستان گیرساوەتەوە و بەو پێیە ئەو چیایانە بوونەتە نیشتمانی سۆمەرییەکان و پاشانیش لەوێوە بەرەو دەشتی لیتەیی کۆچیان کردووە. بەهۆی تۆمارکردنی دەنگوباسی لافاوەکە لەلایەن سۆمەرییەکانەوە بۆمان دەردەکەوێت کە زیۆسەدرا سۆمەری بووە و سامی نەبووە، بردنەوەی نەژادی نەتەوە کۆنەکانی دوورگەی عەرەبی بۆ کورێکی زیۆسەدرا هەڵەیەکی مێژوویی زۆر گەورەیە کە پێیان دەگوترێت (سامییەکان) راستە نێوی (نوح) و (سام) نێوێکی سامین، بەڵام ئایا لە بنەڕەتدا ئەمانە سامی بوون...؟! بێگومان نەخێر.

مێژوونووسە عەرەبەکانیش بەتایبەتی مێژوونووسانی عێراقی لایان لەم مەسەلەیە کردووەتەوە و وازیان لە نێوی سامی و سامییەکان هێناوە بۆ ئەو نەتەوانەی کە لە دوورگەی عەرەبیدا لە هەزارەی سێیەمی پ.ز دا ژیاون، بەڵکو ئێستا نێوی دوورگەیی (الجزريون)یان بۆ بەکار دەهێنن. هۆی ئەم هەڵە مێژووییە و گۆڕینی نێوی زیۆسەدرای سۆمەری بۆ نوحی سامی (دوورگەیی) و گێڕانەوە و پەرچڤەکردنی ئەفسانە سۆمەرییەکانە لەلایەن نەتەوە سامییەکان و هی ترەوە، دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی لافاوەکە پاش سۆمەرییەکان بەزمانەکانی ئەکەدی و بابلی و ئاشووری و عیبری و چەندین





زمانی کۆنی دیکە نووسراونەتەوە، کە هەریەکەیان نێوێکیان لە پاڵەوانەکە (زیۆسەدرا) ناوە باوەڕیش ناکەم ئەم هەموو لافاوە مەزنە لە مێژوودا رووی دابێت و هەر جارەی پاڵەوانێک و بەنێوێکی جیاوازەوە مرۆڤایەتیی لە خنکان رزگار کردبێت...!. تەنانەت لە ناوچەکانی تریشدا چیرۆکی لافاوەکەیان گێڕاوەتەوە و نێوی پاڵەوانە راستینەکەیان گۆڕیوە، بۆ نموونە لە سەرچاوە هندۆسییەکاندا نێوی زیۆسەدرا بووەتە (مانۆ) لەسەرچاوە چینییەکاندا نێوی پاڵەوانەکە بووەتە (یۆ) و پاشان لەنێو یۆناندا بووەتە (ئۆکایگیس) و تەنانەت دەنگوباسی ئەم لافاوە لەلایەن نەتەوە دوورەکانی ئۆسترالیا و هەردوو ئەمریکاشدا گێڕدراوەتەوە[٥٢].

هەروەکو لە باسی سۆمەرییەکان و کورتەیەکی مێژووەکەیاندا باس کرا، سۆمەرییەکان لە پێش لافاوەکەدا، هەشت پادشا فەرمانڕەواییان کردوون و کە هەریەکەیان ژمارەیەکی خەیاڵی ژیانی بەسەر بردووە، ئەم پادشایانە، پێ دەچێت کە فەرمانڕەوایی (فوراتییە سەرەتاییەکان)یان کردبێت و پاش لافاوەکە و بڵاوبوونەوەی سۆمەرییەکان جارێکی تر لە چیاکانی کوردستاندا و رەوکردنیان بەرەو باشوور خەریکی دامەزراندنی شارستانی بووبێتن و بەو شێوەیەی کە باس کرا بنەماڵە فەرمانڕەواکانیان بەردەوام بووە تا ئەو کاتەی کە ماڵئاواییان لە مێژوو کردووە لە (٢٠٠٦) پ.ز دا. هەر هەمان تەمەن و ماوەی فەرمانڕەوایی ئەو پاشایانە تەمەنی زیندەگانیی نوح پێغەمبەرمان بیر دەخاتەوە کە ئەمیش بەهەمان شێوە تەمەنی درێژ و خەیاڵی بووە کە ئەوە دەگەیەنێت ئەو پادشایانە و نوح یان زیۆسەدرا لە یەک ماوەی زەمەنیدا ژیابێتن.

چیرۆکی لافاوەکە وەک هەر بەڵگەیەکی ئارکیۆلۆژیی تر، کوردستانی بوونی سۆمەرییەکان دەسەلمێنێت و نەژادیان بەرەو چیاکانی کوردستان دەباتەوە.

## پەراوێزەکانی بەشی شەشەم:

(1) ب. س. پ. لا، ٨٠، دیڤید و جوان اوتیس.
(٢) ب. س. پ. لا، ٢٦٩.
(٣) ب. لا، ٢٢، تەوفیق وەهبی، بنەچەکەی کوردان و بنچینەی زمانی کوردی، وەرگێڕانی: تاها فەیزی زادە، چاپەمەنیی سەییدیان، مەهاباد، بێ بەروار.
(٤) ب. لا، ٨، د. جەمال رەشید ئەحمەد، لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی دەربارەی مێژووی وڵاتی کوردەواری، بەغدا، ١٩٨٨.
(٥) ب. س. پ. لا، ٧، د. فوزی رشید، قواعد اللغة السومرية.
(٦) ب. لا، ١٠٧، د. پاکیزە رەفیق حیلمی، گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژمارە ١١٢.
(٧) ب. س. پ. لا، ٢٢ و٢٣، تەوفیق وەهبی.
(٨) ب. س. پ. لا، ٢٦، د. فاضل عبدالواحد علي.
(٩) ب. س. پ. لا، ١٢٢، د. جەمال رەشید ئەحمەد، لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی دەربارەی مێژووی وڵاتی کوردەواری.
(١٠) ب. س. پ. لا، ٦٠، احسان نوری.
(١١) ب. لا، ١٨ و ١٩، نەژادی عەزیز سورمێ، گۆڤاری کاروان، ژمارە ٨٠.
(١٢) بەداخەوە بیرم نەهاتەوە کە ئەم زانیارییەم لە چ کتێبێکی مامۆستا (مەسعود محەمەد)دا خوێندووەتەوە تاوەکو نێویم ببردایە ئەگەر بەهەڵەدا نەچووبم کتێبی (لسان الکرد)ە.
(١٣) ب. صلاح سعدالله، چارەسەری مەسەلەی سۆمەرییەکان: سۆمەرییەکان کوردن، رۆژنامەی عەرەبیی (الحیاة)، ژمارە ١١٦٦٧، رۆژی ٢٩/١/١٩٩٥.
(١٤) ب. لا، ٨، حسن ارفع، کردها ویک بررسی تاریخی وسیاسی، ترجمه از متن انگلیسی، لندن، چاپ دانشکده اکسفرد. نیویورک، تورنتو، ١٩٦٦.
(١٥) ب. لا، ١٣، ج. ار. درايڤر، الكرد في المصادر القديمة، ترجمة فؤاد حمه خورشيد، مطبعة الديواني، بغداد، ١٩٨٦.
(١٦) ب. س. پ. لا، ٢١٦، د. جەمال رەشید ئەحمەد، لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی...
(١٧) ب. س. پ. لا، ٢١٦.
(١٨) ب. س. پ. لا، ١٤١، جۆرج رۆ.
(١٩) ب. لا، ٣٣٠، جەمال بابان، گۆڤاری کۆڕی زانیاریی کورد، بەرگی ٨، ١٩٨١.





(٢٠) ب. س. پ. لا، ٢١٠، جۆرج رۆ.
(٢١) ب. س. پ. لا، ٢٩٢، د. سامي سعيد الاحمد.
(٢٢) ب. س. پ. لا، ٨٤، جین پوترو.
(٢٣) ب. س. پ. لا، ١٦٩، العراق في موكب الحضارة.
(٢٤) ب. لا، ١٢٣، سليم طه التكريتي، الحياة اليومية في بلاد بابل وآشور، بغداد، ١٩٨٦.
(٢٥) ب. لا، ٥٠١، تەها باقر، گۆڤاری کۆڕی زانیاریی کورد، بەرگی ٤، ١٩٧٤.
(٢٦) ب. لا، ١٣ د. جمال رشيد احمد دراسات كردية في بلاد سوپارتو، بغداد، ١٩٨٤.
(٢٧) ب. س. پ. لا، ١٣٢، د. سامي سعيد الاحمد.
(٢٨) ب. س. پ. لا، ١٤ و ١٥، د. جمال رشيد احمد، دراسات كردية في بلاد سوپارتو.
(٢٩) ب. لا، ١٦٥، حضارة العراق، اعداد نخبة من أساتذة التاريخ، الجزء الأول، بغداد، ١٩٨٥.
(٣٠) ب. س. پ. لا، ١٠٣، د. فاضل عبدالواحد علي.
(٣١) ب. لا، ٣٢، اندرية بارو، برج بابل، بغداد، ١٩٨٠.
(٣٢) ب. س. پ. لا، ٩٥، د. فاضل عبدالواحد علي.
(٣٣) ب. س. پ. لا، ١٨٩، حضارة العراق، الجزء الأول.
(٣٤) ب. س. پ. لا، ٤٤٨، طه باقر، مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة.
(٣٥) ب. س. پ. لا، ٥٦٩.
(٣٦) ب. س. پ. لا، ١٠٧، د. فاضل عبدالواحد علي.
(٣٧) ب. س. پ. لا، ٤٥٦، سليم طه التكريتي.
(٣٨) ب. س. پ. لا، ٤٩ د. يوسف حبي.
(٣٩) ب. س. پ. لا، ٦٧، اندريه بارو.
(٤٠) ب. س. پ. لا، ٣٧.
(٤١) ب. س. پ. لا، ٧١.
(٤٢) ب. لا، ١١، د. نەبیلە ئیبراهیم، ئەفسانە، وەرگێڕ بۆ کوردی: محەمەد بەدری، بەغداد، ١٩٨٦.
(٤٣) ب. لا، ٤، صالح بن حمادي، الأسطورة، بغداد.

(٤٤) ب. س. پ. لا، ٤٣، جین پوترو.
(٤٥) ب. س. پ. لا، ١٣٢ و ١٣٣، د. فاضل عبدالواحد علي.
(٤٦) ب. س. پ. لا، ٢٦٩.
(٤٧) ب. ئیسحاحی ٧ و ٨ی تەورات.
(٤٨) ب. لا، ٣١ مینۆرسکی، کورد، حەمە سەعید حەمە کەریم کردوویەتی بەکوردی، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر، ١٩٨٤.

(49) P. 7 - Dr. Larry. G. Herr

Archeologic in bijbelsc landon

4. Het tijdperk van de patriarchen

ESDA

(٥٠) ب. س. پ. لا، ٧٥، د. جمال رشید، دراسات كردية في بلاد سوبارتو، هەروەها لا، ٦٣ لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی...
(٥١) ب. لا، ٨٧، محەمەد ئەمین زەکی، کورد و کوردستان، جلد ١-٢-٣- چاپخانەی دار السلامی بەغدا، ١٩٣١، انتشارات سییدیان، مەهاباد.
(٥٢) ب. س. پ. لا، ٢٤٠ و ٢٤٢، د. سامی سعید الاحمد.



## کۆتایی و سەرەنجام

کوردستان هەر لە بەرەبەیانی مێژووەوە تاکو ئێستا وڵات و مێژووی ئێمەیە و دەبێت ئێمەی کورد خۆمان مێژووەکەی بنووسینەوە، با لەوە زێتر چاوەڕوانی خامەی بێگانە نەبین، کە هەریەکەیان بۆ مەبەستی تایبەتی خۆیان کوردستان و کوردیان لە مەنگەنە داوە... بۆ دەبێت بەدرێژایی سەدان ساڵ نووسەرەکانمان خەریکی حاشیە و حاشیە لەسەر حاشیە! نووسین و مێژووی عارەب بن و یەکێکیان تاکە ئاوڕێک لە مێژووی نەتەوەکەی خۆیان نەدەنەوە...!! با واز لە مێژووی شەڕی... بهێنین و خەریکی زیندووکردنەوەی مێژوو و فەرهەنگی نەتەوەییمان بین، وڵاتەکەمان خاوەنی مێژوویەکی چڕوپڕە و زۆربەشی لەژێر خاکدایە... نەتەوەکانی تر ئەگەر مێژووی خۆیانیان تەواو و پوختە تۆمار نەکردبێت چ کارێکیان بەمێژووی وڵاتەکەی ئێمەوە هەیە...! ئەگەر ئەو نووسەر و کوردناسە بێگانانە هەزاران لاپەڕەمان لەسەر رەش بکەنەوە، بەوە نابێت کە زانایەکی مێژووانی کورد چەند لێکۆڵینەوەیەک لەسەر وڵاتەکەی خۆی بکات و تیشکێک ئەگەر بچووکیش بێت، بخاتە سەر مێژووی کورد و کوردستان... بەداخەوە هەرچەندە ئەو هەوڵانەمان زۆر کەمن... و بەتایبەتی لە مێژووی کۆنی کوردستاندا، مێژوونووسی پسپۆڕمان هەر زۆر زۆر کەمە... ئەمە جگە لەوەی کە تاوەکو ئێستا رێژەیەکی کەم نەبێت، نەمانتوانیوە ئەوەی بێگانەکانیش لەسەریان نووسیوین پەرچڤەی زمانەکەی خۆمانی بکەین، تاوەکو تێی بگەین ئەوانە چۆن لە ئێمەیان روانیوە و چۆن لە خاکی هەزاران ساڵەی ئێمەیان تۆژیوەتەوە.

شارستانیی کوردستان، زۆر دێرینە و لەپێش سەدان هەزار ساڵ لەمەوبەرەوە مرۆڤی کۆنی تێیدا ژیاوە و خاکەکەمان بووەتە خاڵی یەکەمین شارستانی لە مێژووی مرۆڤایەتیدا... سۆمەرییەکان کە بەمەزنترین و ژیارترین رەگەزە کۆنەکانی سەر رووی زەمین دەژمێردرێن، لە نیشتمانەکەی ئێمەوە بۆ دەشتی لیتەیی کۆچیان کردووە و لە کوردستانەوە یەکەمین تۆوی شارستانییان لەگەڵ خۆیاندا بردووەتە دەرەوە، ئەو پایە و

پلە مەزنەی کە سۆمەرییەکان لە بواری ئایین و رامیاری و یاسا و ئەدەب و هونەر و زانست و... هتد پێی گەیشتوون لە ناوچەکانی دەشتی لیتەییدا کارێکی کتوپڕ و لەناکاو نەبووە. هەروەکو چۆن ئەم پێشکەوتنەی ئێستای مرۆڤایەتی زادەی هەموو ئەو داهێنانەن کە سۆمەرییەکان و رەگەزەکانی دوای ئەوان پێی گەیشتوون. بەهەمان شێوە سۆمەرییەکانیش تۆوی ئەو شارستانییە مەزنەی خۆیانیان لە کوردستانی کۆندا بردووەتە دەرەوە، لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کە مرۆڤەکانی شانەدەر و هەزارمێرد و بێستون و گۆڕاین، خاوەنی یەکەمین بیر و داهێنانی شارستانێن و ئێمەش و هەموو مرۆڤایەتی قەرزباری ئەو کەرەستە بەردین و گۆزە و دیزە و دەستکەوان و شتانەی تریانین کە بوونەتە خاڵی دەستپێکردنی شارستانی و تاوای لێ هات کە بەم شێوەیەی ئێستا دەیبینین. بەداخەوە وڵاتەکەمان هەزاران ساڵ پێش ئێستا خاوەنی ئەو هەموو پێشکەوتنە بووە و بووەتە خاڵی یەکەمینی شارستانیی مرۆڤایەتی، کەچی تاوەکو ئێستا ئێمە زانیارییەکی ئەوتۆمان دەربارەیان نییە و لەوەش پاشاگەردانی ترا! ئەو خاکەی کە ئەو هەموو گۆڕانکارییە مەزن و ترسناکەی لە مێژووی مرۆڤایەتیدا گێڕاوە، ئێستا وڵاتێکی ژێر دەستە و بەشبەشکراو و دواکەوتووە؟! بەڵام بەهیوای ژیاندنەوەی ئەو شارستانییە مەزنەی کوردستانی ئەوسا و وەدەست هێنانەوەی شکۆی لەنێوچووی کوردستان و کورد...



# سەرچاوەكانى ئەم لێكۆڵینەوەیە

**یەکەم: بەزمانی کوردی:**

١- محەمەد ئەمین زەکی بەگ، کورد و کوردستان، جلد: ١، ٢، ٣، چاپخانەی دار السلامی بەغدا، ١٩٣١، انتشارات سییدیان، مهاباد.
٢- تەوفیق وەهبی، بنەچەکەی کوردان و بنچینەی زمانی کوردی، وەرگێڕانی: تاها فەیزی زادە، چاپەمەنیی سەییدیان، مەهاباد، [بێ بەروار].
٣- مینۆرسکی، کورد، حەمە سەعید حەمە کەریم کردوویەتی بەکوردی، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر، ١٩٨٤.
٤- د. جەمال رەشید ئەحمەد، لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی دەربارەی وڵاتی کوردەواری، بەغداد، ١٩٨٨.
٥- ئەلیکساندەر گەرێۆڤسکی، نهێنی کۆنترین مێژوو، وەرگێڕانی لە رووسییەوە: جەلال تەقی.
٦- د. جەمال رەشید ئەحمەد شاهۆیان، لە مێژووی کوردستاندا چاند و ئایین و هونەر، لە بڵاوکراوەکانی کۆمەڵەی رۆشنبیری و هونەری کوردی لە فریزلاند، هۆڵەندا، ١٩٩٤.
٧- د. نەبیلە ئیبراهیم، ئەفسانە، وەرگێڕ بۆ کوردی: محەمەد بەدری، بەغداد، ١٩٨٦.
٨- تاها باقر، گۆڤاری کۆڕی زانیاریی کورد، بەرگی چوارەم، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغداد، ١٩٧٤.
٩- جەمال بابان، گۆڤاری کۆڕی زانیاریی کورد، بەرگی هەشتەم، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغداد.
١٠- د. جەمال رەشید، مرۆڤی چاخی بەستەڵەک، گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژمارە ١١١، بەغداد، ١٩٨٦.
١١- د. پاکیزە رەفیق حیلمی، گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژ ١١٢.
١٢- د. پاکیزە رەفیق حیلمی، گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژ ١١٣.
١٣- د. پاکیزە رەفیق حیلمی، گۆڤاری کاروان، ژمارە ٦٢.
١٤- نەژاد عەزیز سورمێ، گۆڤاری کاروان، ژمارە ٨٠.

**دووەم: بەزمانی عەرەبی:**

١٥- جۆرج رۆ، العراق القديم، ترجمة حسين علوان، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٨٤.

١٦- د. طه باقر، ملحمة گلگامش، بغداد، ١٩٨٠.

١٧- د. طه باقر، مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة، الجزء الأول، الطبعة الثانية، بغداد، ١٩٨٦.

١٨- سليم طه التكريتي، الحياة اليومية في بلاد بابل وآشور، بغداد، ١٩٨٦.

١٩- العراق في التاريخ، اعداد: نخبة من اساتذة التاريخ الجزء الأول، بغداد، ١٩٨٣.

٢٠- حضارة العراق، اعداد: نخبة من اساتذة التاريخ، الجزء الأول، بغداد، ١٩٨٥.

٢١- د. سامي سعيد الأحمد ورضا جواد الهاشمي، تاريخ الشرق الأدنى القديم (بلا تاريخ).

٢٢- جين پوترو، الشرق الأدنى، الحضارات المبكرة، موصل، ١٩٨٦.

٢٣- العراق في موكب الحضارة، اعداد نخبة من اساتذة التاريخ، بغداد، ١٩٨٨.

٢٤- د. فوزي رشيد، القوانين في العراق القديم، بغداد، ١٩٨٨.

٢٥- د. سامي سعيد الاحمد، المعتقدات الدينية في العراق القديم، بغداد، ١٩٨٨.

٢٦- فؤاد حمه خورشيد، العصر الجليدي البلايستوسيني في كردستان، بغداد، ١٩٨٦.

٢٧- القرآن.

٢٨- الكتاب المقدس، العهدين القديم والحديث.

٢٩- د. فوزي رشيد، السياسة والدين في العراق القديم، بغداد، ١٩٨٣.

٣٠- د. فاضل عبدالواحد علي، من الواح سومر الى التوراة، بغداد، ١٩٨٩.

٣١- د. سامي سعيد الأحمد، العراق القديم، الجزء الأول، بغداد، ١٩٧٨.

٣٢- د. هاري ساكز، عظمة بابل، موصل، ١٩٧٩.

٣٣- سيتين لويد، فن الشرق الأدنى القديم، بغداد، ١٩٨٨.

٣٤- ديڤيد وجوان اوتيس، نشوء الحضارة، بغداد، ١٩٨٨.

٣٥- كونراد برويسر، المباني الأثرية في شمال بلاد الرافدين، بغداد، ١٩٨١.

٣٦- انتوان مورتكات، الفن في العراق القديم، بغداد ١٩٧٥.

٣٧- المواقع الأثرية في العراق، اعداد: مديرية الآثار العامة، بغداد، ١٩٧٠.



٣٨- د. احمد سوسه، تاريخ حضارة وادي الرافدين، الجزء الأول، بغداد، ١٩٨٣.

٣٩- د. يوسف حبي، الإنسان في أدب وادي الرافدين، بغداد، ١٩٨٠.

٤٠- أندرية بارو، برج بابل، بغداد، ١٩٨٠.

٤١- د. فوزي رشيد، قواعد اللغة السومرية، بغداد، ١٩٧٢.

٤٢- د. جمال رشيد احمد، دراسات كردية في بلاد سوبارتو، بغداد، ١٩٨٤.

٤٣- د. فوزي رشيد، الشرائع العراقية القديمة، بغداد، ١٩٧٩.

٤٤- ج. ار. درايڤر، الكرد في المصادر القديمة، ترجمة: فؤاد حمه خورشيد، مطبعة الديواني، بغداد، ١٩٨٦.

٤٥- صالح بن حمادي، الأسطورة، بغداد.

٤٦- صلاح سعدالله، حل المسألة السومرية، جريدة الحياة، عدد: ١١٦٦٧، في ١٩٩٥/١/٢٩.

**سێیەم: بەزمانی فارسی:**

٤٧- احسان نورى، تاريخ ريشه نژاد كورد، ناشر: كتاب فروشى بزرگ سيديان، چاپخانه پيروز، ١٣٦١.

٤٨- حسن آرفع، كردها و يک بررسى و سياسى ترجمه: از متن انگليسى، لندن، چاپ دانشكده اكسفرد. نيورک تورنتو، ١٩٦٦.

**چوارەم: بەزمانی هۆڵەندی:**

49- Dr. Larry. G. Herr
Archeologie in bijbelse landen
4. Het tijdperk van de patriarcheu.
ESDA

50- Prof. Dr. Göran Burenhult - De eerste mensen - Hoogleraar Archeologie - Universiteit van Stokholm, Zweden-
Printed in Hong Koug - 1994.

51- Samuel Noah Kramer -
De bakermat der beschving - N.V.
1968. Het Parool - Amsterdam.

52- Dr. M. V. Seton - Williams - BABYLON.
Kunstschatten uit Mesopotamië - Vertaling:
Stichting Tekstverzorging, Amsterdam - Printed in Japan - 1981.

